

١٤

# له سەرگوزشتەکانی ژیان

ئەدەبی گاڵتەوگەپ ، روداوی مێژوویی ، بیرەوەری


نووسینی

شێخ موحەممەد خاڵ

**ناوی کتێب:** لە سەرگوزشتەکانی ژیان، ئەدەبی گاڵتەوگەپ، روداوی مێژوویی، بیرەوەری

**نووسینی:** شێخ موحەممەد خاڵ

**ژمارەی سپاردن:** (٣٤٩ ) ساڵی (٢٠٠٧)

**شوێنی چاپ:** کۆمپانیای چاپو پەخشی نووسەر

**نۆرەی چاپ:** یەکەم

**ساڵی چاپ:** ٢٠٠٧

**تیراژ:** ١٥٠٠

**لە بڵاوکراوەکانی:** پرۆژەی (تیشک)، زنجیرە ( 14)

**ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت :** www.tishkbooks.com

**ئیمەیلی پرۆژە:** info@tishkbooks.com

tishkbooks@yahoo.com

**بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان**



**ئەمن ئەمرم بەڵام وێنەم ئەمێنێ**
**هیوام وایە کە خۆشی گەل ببینێ**

## روونکردنەوەیەك دەربارەی گرنگی ناوەڕۆکی ئەم کتێبە

لە کتێبخانەکەی خوالێخۆشبووی باوکمدا، لەناو کۆمەڵێك دەفتەرو فایلی پڕ لە لاپەڕەی زۆر کە زانیاریی‌و رووداوی مێژوویی‌و هەواڵی هەمەجۆری بەنرخی کوردستانی ئەو سەردەمەی تێدا نووسرابوو، دەفتەرێکی بەرگ رەشی شەست لاپەڕەییم بەرچاو کەوت، لەسەرەوەی یەکەم لاپەڕەدا نووسرابوو: قسەی خۆش‌و بەڕێز لەگەڵ قسەی بەرزو بەپێز. دوای خوێندنەوەی‌و لەبەر گرنگیی بڕیارمدا لەچاپی بدەم، بەهیوای ئەوەی کەلێنێك پڕبکاتەوە لە کتێبخانەی کوردیداو جێی رەزامەندی خوێنەرانی بەڕێزبێت ، بەتایبەتی کتێبی ناوبراو زیاتر بریتییە لە قسەی خۆش‌و بەپێز کە خوێنەر دێنێتە پێکەنین‌و بۆ ماوەیەك خەم‌و خەفەت لەبیر ئەباتەوە.

ئەوەی سەرنج رائەکێشێ لەدووتوێی ئەم قسە خۆشانەدا، باسی زۆر رووداوی گرنگی مێژوویی لەناوچەکانی کوردستاندا تێدایە کە هێندێکیان ئەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە سەد ساڵ لەمەوبەر، واتە لەزەمانی خیلافەتی عوسمانیدا. ژمارەیەکی زۆریش لەخاوەنی ئەم قسە خۆشانە گەورە پیاوانی هەڵکەوتووی کوردن کە ناوبانگیان گەیشتۆتە دەرەوەی کوردستانی گەورە، بۆ نموونە: کاك ئەحمەدی شێخ، موفتی زەهاوی، مەولەوی، شێخ رەزای تاڵەبانی، مەلا فەندی هەولێر، حاجی شێخ ئەمینی خاڵ، عەبدوڕڕەحمان پاشای بابان، حاجی سەعید ئاغا، ئەحمەدی عەزیز ئاغا، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، موفتی موحەممەد ئەفەندی، مەحمود پاشای جاف، وەسمان پاشای جاف، مەلا عەبدوڵلای مەریوانی، شێخ مستەفای نەقیب، سەید ئەحمەدی خانەقا، جەلال سائب، مەلا موحەممەدی کۆیە، شێخ مستەفای شێخ عەبدولصەمەدی قازی، شێخ مەعروف قەرەداخی، حەمەی عەبدوڕڕەحمان ئاغا، رەشۆڵ‌و کەسانی تریش.

سوپاس‌و پێزانینی خۆم‌و بنەماڵەی خاڵ بۆ پڕۆژەی تیشك‌و کارمەندانی، کە بەهیممەتی ئەوان ئەم کتێبە لەچاپدرا.

**خالد خاڵ**

**پرۆفیسۆری یاریدەدەر لەزانکۆی سلێمانی**

**٢٠٠٧/٤/٤**

## دەستپێك

پاش غەفڵەتێکی درێژخایەنی جیهانی ئیسلامیی، کە مسوڵمانان بێئاگاییەکی ترسناك رووپێکردبوون و شارەزاییان لەئایینەکەیان کاڵببوەوە، لەگەڵ ئەوەشدا خورافەیەکی زۆر بڵاوببوەوە، دەوڵەتی عوسمانی بەرەو کزیو لاوازی دەچوو، وڵاتانی ئیستعماریش هەر ماوەیەك پارچەیەکیان لێدادەبڕی، لەم حاڵەتە شپرزەدا سیٚ رەوتی نوێکردنەوە و بەئاگاهێنانەوە سەریانهەڵدا:

١ – رەوتی سەلەفییەت لەحیجازەوە بە پێشەوایەتی موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب.

٢ – رەوتی ریفۆرمخوازان لەئەفغانستان و هیندستانەوە بەپێشەوایەتی جەمالەدینی ئەفغانی.

٣ – رەوتی بانگەوازو رێکخستن لەمیسرەوە بەپێشەوایەتی حەسەن بەننا. ئەمەشیان پاش رووخانی خیلافەت بوو

ئەم سیٚ رەوتە وردە وردە بوون بەسیٚ قوتابخانەو بەرەو وڵاتانی دیکەی ئیسلامیی کشان، زۆر لەوڵاتە ئیسلامییەکان پێیانەوە کاریگەر بوون، کوردستانی ئێمەش نەبوێررا لەو کاریگەربوونە، با بە رێژەیەکی کەمتر لەوڵاتانی دیکەش بووبێت.

لەو زانایانەی کاریگەریی رەوتی دووەمیان کەوتەسەرو بوون بە بەشێکی قوتابخانەی ریفۆرمخوازیی لە کوردستاندا دوو مامۆستای بیر رووناك و هەڵکەوتوو بوون:

یەکەمیان: مامۆستا مەلا موحەممەدی جەلیزادەی کۆیە (مەلای گەورە) ١٨٧٦-١٩٤٣، کە مەسعود موحەممەد لەچەند شوێنێکی نووسینەکانیدا باسی کاریگەربوونەکەی دەکات و مەلای گەورە بەشوێنکەوتەی ئەو قوتابخانەیە دادەنێت.

دووهەمیان: مامۆستا شێخ موحەممەدی خاڵ بوو رەحمەتی خوایان لێبێت.

سەبارەت بە کاریگەربوونی شێخی خاڵ بە قوتابخانەی ئەفغانییەوە خۆی دەڵێت: "بێگومان هەموو ئادەمیزادێکی رێك و راساڵ گەلی خۆی خۆشدەوێت، وە حەز بەسەربەرزیو مانەوەی ئەکا، بەڵام هۆی بنەڕەتی کاریگەر لەجیهانی رۆشنبیری مندا نووسینەکانی (جمال الدین)ی ئەفغانی بوو، کە یەکەم بڵێسەی روونکردنەوەی بیرم بوو، چ لەگۆڤاری (العروة الوثقى)دا یان وتە جەمالییەکانی کە بەفارسی ئەینووسین. لەو وتارانەدا بەرچاوم کەوت کە زمان گیانی میللەتە، کە زمان بوو گەل هەیە کە نەبوو نییە، ئەو دوو رستەیە رایان چڵەکانم و بێداریان کردمەوە، تا ئەو کاتەش ئێمە خاوەنی فەرهەنگ نەبووین بەو شێوەیە گۆڤاری (العروة الوثقى)[1] کە جەمالەدین بەڕێوەبەریبوو، (شێخ موحەممەد عەبدە) سەرنووسەری بوو، وە بۆ دەرکردنی شوققەیەکیان لەپاریس بۆگرتبوو، هەوێنی بزووتنەوەی رۆشنبیریم بوو، وەکو هەزارانی وەك منی بێدار کردبووەوە، گۆڕانێك بوو بەسەر هەست و بیرما کە چۆن سوود وەربگرم و سوود ببەخشم".

ئەو جۆش و خرۆشەی مامۆستای خاڵ دەیدرکێنێت، بەرامبەر بە ئەفغانی کە پاشان ئەو رێبازەی لەسەری بوو بە قوتابخانەیەك و چەند تایبەتمەندییەکی لەخۆ گرت لەوانە: هۆگربوونی بە رۆشنبیری، خۆ پرچەککردن بەزانستی شەرعی و سەردەم، ریفۆرمخوازی ئایینی و کۆمەڵایەتی سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی شارستانیەتی ئیسلامیی، نەپسان و کۆڵنەدان لە هۆشیارکردنەوە دژی ئیستعمارو خزمەتی میللەتداو داوای یەکڕیزیکردن.

بۆیە دەبینین مامۆستای خاڵ پێش ئەویش مەلای گەورە لەو تایبەتمەندیانەدا لەناو زاناو مەلای کورددا پێشەنگ و رچەشکێن بوون.

بەنموونە لەپیشاندانی رووی راستی ئیسلام و بەگژاچوونەوەی خورافات کە لەو سەردەمەدا وڵاتی تەنیبوو، مەلای گەورە (فڕی فڕی قەل فڕی) دەنووسێت و شێخی خاڵیش (مەولودنامەی نەوئەسەر)، هۆی ئەم نووسینەش وەك شێخ خۆی دەڵێت: "لەجیاتی هەندیٚ لەنامیلکەی تر لەخەرافیات خاڵیبوو".[2]

---

١ رۆڤار، ژمارە (٢٩) شێخ موحەممەدی خاڵ منەوەرێکی گەورەو چراخانێکی زمانی کوردی. دیداری موحەممەد صاڵح حەسەن.

٢ رۆڤار، ژمارە (٢٩) شێخ موحەممەدی خاڵ منەوەرێکی گەورەو چراخانێکی زمانی کوردی. دیداری موحەممەد صاڵح حەسەن.

هەر لەو غەفڵەتەدا کە لەسەردەمی ئەو دوو زانایەدا کۆمەڵگەی تێکەوتبوو، قورئان کرابوو بە کتێبێکی پیرۆزی بێگیا ن تەنها بۆ نوشتەو تەبەڕوك و بۆنەکان بەکاردەهێنرا، نەدەبوو بەکوردی مانا بکرێت، کەچی ئەوان قورئانیان بەزمانێکی پاراوی کوردی تەفسیرکرد، تا خەڵکی بزانن قورئان یانی چیو داوای چی ئەکات. ئەمەشیان لە تایبەتمەندێتی قوتابخانەکەی ئەفغانی بوو.

باسەکەی ئێمە تایبەتە بەشێخی خاڵەوە، بۆیە هەر لەسەر ئەو دەچین (باسی مەلای گەورەو کاریگەربوونی بەجەمالەدینەوە ناکەین)، گەر سەرنجی تەفسیری خاڵ بدەین دەبینین لەوێشدا هەر لەسەر رێچکەی قوتابخانەی ریفۆرمخوازیی رۆشتووە، وەك خۆی دەڵێت: "ساڵی ١٩٣٣ جزمی عەممەمان بە کورتیو بە کوردی تەفسیر کرد لەسەر رێبازی شێخ موحەممەد عەبدە."[١]

مامۆستا جگە لە هۆشیارکردنەوەو چاکسازیی کە تایبەتمەندی قوتابخانەی جەمالەدینو شێخ موحەممەد عەبدە بوو، هۆیەکی دیکەی تەفسیری قورئان کردنەکەی ئەوەبو: لەلای نەنگی بوو قورئان بەکوردی نەکرێت "گەلی کورد گەلێکی مسوڵمانە بەلامەوە نەنگ بوو گەلێك (٢٥) ملیۆن کەس بێ لە کتێبخانەیدا تەفسیری قورئانی پیرۆز بەزمانی خۆی نەبێ، ئەوە لەگەڵ خزمەتگوزاری ئەو گەلەدا بەئیسلام رێك ناکەوێ دەوری سەلاحەددینی کوردی ئاشکرایە لەمێژوودا کە چۆن وڵاتانی ئیسلامیی پاراست لەپەلاماری بێگانەکان، نەبوونی تەفسیری قورئانی پیرۆز بەکوردی عەیبێکە لەسەر شانی زانایانی ئایین، بۆیە دەستمکرد بەتەفسیرکردنی قورئان".[٢]

جگە لەبواری ئایینی، مامۆستای خاڵ لەبواری زمانو فەرهەنگیشدا داهێنەرانە هاتەمەیدانو جێپەنجەی بەرچاوی بەو بوارانەدا دیارە، بەڵام ئیلهامبەخشی ئەو خزمەتانەشی هەر لەو قوتابخانەوە سەریهەڵدا، هەروەك دەڵێت: لە سەرەتاوە خۆم زۆرم حەز بەخوێندنو نووسین دەکردو زۆربەی ئیلهامەکانم لەسەید جەمالەدینی ئەفغانییەوە وەرگرتووە، چونکە بەردەوام دەمخوێندنەوە، کە لە وتەیەکیدا دەڵێت: "هەر گەلێك فەرهەنگی نەبێت گەل نییە".[٣]

مامۆستا بەم نووسینانە خزمەتی بەدینو نەتەوەکەی دەکرد لەلایەکی دیکەوە پاڵنەرەکەشی هەم نەتەوەییو هەم ئایینی بوو، لەیەکیشی جودانەکردنەوە، دکتۆر خالید خاڵ دەڵێت: "کەسانی تر ئەگەر تەنها هەستی نەتەوایەتی پاڵی پێوە ئەنا بۆ بەربەرەکانی ئەو رژێمانەی کە بەردەوامبوون لەکاولکردنی کوردستانو زەوتکردنی خاکمان. شێخ موحەممەدی خاڵ لەگەڵ هەستی نەتەوایەتییدا هەسی ئایینیشی رۆڵێکی گەورەی هەبوو لەزیادکردنی گڕو بڵێسەی تۆڵەسەندن تێیدا بەرامبەر دوژمنانی کوردو کوردستان، لەو باوەڕەدابوو کە ئەبێ ئایین واعزێکی نیشتمانیو نەتەوایەتیش بێ، خەباتی نیشتمانیش پێویستییەکی ئایینی بێ".[٤]

بەوشێوەیە مامۆستای خاڵ بەزانیارییەکی تێروتەسەلی شەرعیو فەرهەنگییەوە، دەستی لەنووسین هەڵنەگرت تا لەهەردوو بواری ئایینیو فەرهەنگیدا کۆمەڵە شاکارێکی داهێنەرانەی ئافراند، کە بەشانازییەوە شایەنی شەرەف سەرقافڵەیەتیی لەهەردوو بوارەکەوە پێببەخشرێت، تەفسیری خاڵو فەرهەنگی خاڵو پەندی پێشینانەکەی بەڵگەی روونی ئەو شایەتیدانەن.

ئەوانەی لە پێشەوە باسمانکردن تایبەت بوون بە کاریگەربوونی مامۆستا شێخ موحەممەدی خاڵ بە قوتابخانەی ریفۆرمخوازیو سەرقافڵەبوونی لە بوارەکانی نووسیندا، کەلە بەشێکی بەرهەمە چاپکراوەکانیدا ئاشکران، سەبارەت بەم دەستنووسە ناکامڵەی بەردەستیشمان وادیارە شێخی خاڵ ویستبێتی جگە لەو بوارانە داهێنانێکی دیکە بکات

---

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

3 هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٤ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

لەزیندووکردنەوەی لقێکی فەرامۆشکراوی ئەدەبی کوردیدا، کە بەدەگمەن نەبێت ئاوڕی لێنەدراوەتەوە، ئەویش گێڕانەوەی سەرگوزشتەو نوکتەی پێکەنین ئامێزە، کە لقێکی ئەدەبەو بە ئەدەبی گاڵتەوگەپ ناسراوە.

ئەدەبی گاڵتەوگەپ: چیرۆکێکی کورتە بەڵام بەجۆرێکی گاڵتەئامێز داڕێژراوەو گیانی پێکەنینی کراوە بەبەردا ئەمیش لەریزی فۆلکلۆردایە،[1] (بێگومان ئەگەر خاوەنەکەی دیار نەبێت)

ئەم لقەی ئەدەب لەناو گەلانی دراوسێدا زۆر بڵاوەو لەمێژە نووسراوەتەوە، کتێبی (الأغاني) ئەبو فەرەجی ئەسفەهانی و (نزهة القلوب) دیارترین نموونەی ئەم لقەن لە ئەدەبی عەرەبیدا.

لەناو گەلی کوردیشدا ئەم لقەی ئەدەب بەربڵاوەو دەم بەدەم نەوەکان بۆ یەکتریان گێڕاوەتەوە، بەتایبەت لەناو چینی مەلاکانو ناو حوجرەکانی کوردستاندا برەوی زیاتری هەیە، تا گەیشتووەتە ئەو ئاستەی مەلا وەك قارەمانی ئەم لقە ناوزەد دەکرێت، بەڵکو زۆرجار کە سەرگوزشتەیەکی خۆش یان نوکتەیەکی سەرنجڕاکێشو پێکەنیناوی گێڕرابێتەوە بەڕاستو ناڕاست هەر دراوەتە پاڵ مەلاو حوجرەکان. پێدەچێت هەر ئەمەش مەلای مەزبوورەی خولقاندبێت.

مەبەست لەم لقەی ئەدەبیش واتە: (لەمجۆرە حیکایەتە (گاڵتەوگەپ) بێجگە لە دەربڕینی جەوهەری فەلسەفەی چاکەو خراپەو شتێکی تری تیایە کە بەتێکڕایی لەگەڵ حیکایەتەکانی تری گاڵتەوگەپی کوردی کە پەردەیەکی (ئایینی)یان پێوەیەو باس لە بیروڕای ئایینی ئەکەنو هەڵوێستێ بەرامبەریان پیشان ئەدەن، ئەخرێنە خانەی باسی ئایینەوە).[2]

کەچی ئەم لقەی ئەدەبی کوردی جگە لە مامۆستا عەلادین سەجادی کە ئەویش شەلم کوێرم هیچ نابوێرم دەستپارێزی نەکردووەو چاكو خراپی تێکەڵ کردووە، لەنرخی (رشتەی مرواری)یەکەی دابەزاندووە، کەسی دی بەنووسین نەکەوتووەتە کۆکردنەوەی ئەمجۆرە ئەدەبەوە. بەم دەستنووسەدا دیارە مامۆستا شێخ موحەممەدی خاڵ پرۆژەیەکی گەورەی لەم بوارەدا دابێتەبەر، بەڵام درەنگتر دەستبەکار بووە وەك خۆی لە پێشەکیەکەدا ئاخی بۆ هەڵدەکێشێت، بۆیە لەو (خەرمانە) گەورەیە تەنها چەند (مەلۆ)یەکی کەمی پێکۆکراوەتەوە، تەنانەت پێڕانەگەیشتووە ئەم کەمانەش شەنو کەو بکات. چونکە ئەمجۆرە ئەدەبە لەگەڵ گرنگیو ناسکییدا ئەگەر ئاشنایانی وەك مامۆستای خاڵ تەتەڵەیان نەکەن، ئەدەبێکی هەڵماڵراوو بێ مەبەست دەرئەچێت، بەڵکو دەبێتە باسکردنی هەندێ قسەی بێجێو سەرگوزەشتەی داشۆڕینو هەرزەکارانە، واتە لەریزی ئەدەب نامێنێ. ئامانجو مەبەستەکەی کە دکتۆر عزەدین ئاماژەی پێدەکات لەدەستیدەدا.

مامۆستای خاڵیش هەرزوو دەرکی بەم راستییە کردووە، بۆیە لەپێشەکیە کورتەکەیدا بۆ ئەم بەرهەمە، پاش هاندانی رۆشنبیران بۆ کۆکردنەوەی ئەو جۆرە سەرگوزەشتانە دەڵێت: "بەڵام دەخیل سەد دەخیل قسەی ناشیرین مەنووسن".

بێگومان ئەم وەسێتەی مامۆستا شێخ موحەممەدی خاڵ ئەگەر بەجێهێنرا لەڕووی ئایینییشەوە کۆکردنەوەی ئەم سەرگوزەشتانە رەخنە هەڵناگرن، بەڵکو بایەخی تایبەتییان دەبێت، وەك لە رەوشتو ژیانی پێغەمبەری خوادا (د.خ) چەندین رووداوی پێکەنیناویو قسەی بەتوێکڵو نوکتەی خۆش گێڕراوەتەوەو پێغەمبەری خواش (د.خ) بەشداربووە تیایاندا، هەمیشەش راستی وتووە.

ئەم پرۆژەیەی مامۆستا شێخ موحەممەد بەو ناکاملێییەش گرنگی خۆی هەیە، دیارە ویستویەتی شاکارێکی دی بخاتە کتێبخانەی کوردییەوە، لەمەشدا ئایینو ژیان پێکەوە گرێبدات وەك بەرهەمەکانی دیکەی، بەڵام بەداخەوە هەر ئەوەندەی بۆ لواوە کە دەلاقەیەك بکاتەوە لەڕووی ئەم لقە پشتگوێخراوەی ئەدەبی کوردیدا. ئەگەر سەرنجی بەشی کۆتایی نووسینەکە بدەین، بە تایبەت دە سەرگوزشتەی کۆتایی، دەردەکەوێت مامۆستا رەوتی نووسینەکەی گۆڕیوە لە نوکتەی گاڵتەوگەپەوە بۆ گێڕانەوەی هەندێك روداوی مێژوویيو بیرەوەری خۆی، تۆ بڵێی مامۆستا ویستبێتی یاداشتی بیرەوەریەکانی خۆی بکات؟ یان ئەوەی لە ژیان وەریگرتووە بۆ ئێمەش بگێڕێتەوە؟

---

١ ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، ل١٦١ د. عزەدین مستەفا رەسوڵ.

٢ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

وەڵامی ئەم پرسیارانە پێویستی بە پشکنینێکی وردتری کونو قوژبنی کتێبخانە دەوڵەمەندەکەی مامۆستا دەبێت، کێ دەڵێت زیاتر لەم بابەتانەی لە پەراوێزی کتێبو پارچە کاغەزو لاپەڕەی گچکەدا نەنووسیبێتەوە؟ بۆیە (پرۆژەی تیشک) بەچاکی زانی ئەم بەرهەمە بەچاپ بگەیەنێت، بێگومان بەچاپگەیاندنی دەربڕینی وەفایە بۆ ئەو خزمەتە گەورانەی مامۆستا کە بەئایینو فەرهەنگی کوردی کردووەو کەلێنی گەورەی پڕکردۆتەوە.

ئەم هەوڵەی (پرۆژەی تیشک) هەنگاوی دووەمیەتی لەخزمەتکردنی ئەو زانایانەی جێپەنجەیان دیارە لەخزمەتکردنی ئایینو گەلەکەیاندا، هەنگاوی یەکەم (سەدەیەك تەمەنی نوورین)ی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس بوو. خوا یاربێت بەنیازین هەنگاوی دیکەشیان هەر لەم بوارەدا بەدوادا بێت.

سەبارەت بەچۆنیەتی دەستکەوتنی ئەم بەرهەمەش، دەگەڕێتەوە بۆ دکتۆر خالید خاڵ کە بەپەرۆشەوە بابەتەکانی بۆ کۆکردینەوەو هەر ئەویش ژمارەکانی رۆژنامەی یەکگرتووی دەستخستین کە نزیکەی دە سەرگوزشتەیان لەژمارەکانی ئەو رۆژنامەیەدا بڵاوکرابووەوە، ئاسانکاریی زۆر بۆ کردین دەبێت پێشەکی سوپاسی بەڕێزی بکەین.

**پرۆژەی تیشک**

## پوختەیەك لە ژیاننامەی مامۆستا شێخ موحەممەدی خاڵ

شێخ موحەممەدی خاڵ کوڕی شێخ عەلی حاجی شێخ ئەمینی خاڵە، لەنەوەی مەلا مستەفای موفتی بابانەکانە، کە ئەویش لەنەوەی زانای گەورە مەلا ئەبوبەکری موسەنیفە، مامۆستا خاڵ لەساڵی (١٩٠٤) لەشاری سلێمانی لە بنەماڵەیەکی ئاینیی و ناودار لەدایك بووە، لەتەمەنی (١٠) دە ساڵیدا باوکی بەنەخۆشی ئەمرێ، حاجی شێخ ئەمینی باپیری شێخ موحەممەدو هەر چوار براکەی دەباتە لای خۆی و بەخێویان دەکات. هەر لای خۆی دەیخاتە خوێندن و پەروەردەی لەئەستۆ دەگرێت.

مامۆستا شێخ موحەممەدی هەر لەمنداڵییەوە هۆگری خوێندن و نووسین بووە، بەشی زۆری خوێندنی لای شێخ عومەری قەرەداخی بووە، هەروەها لای مەلا حسێنی پەسکەندی و شێخ جەلالی قەرەداخیش خوێندوویەتی، لەساڵی (١٩٣١) کە باپیری وەفات دەکات بەئامادەبوونی موتەسەریفی سلێمانی و گەورە کاربەدەستان و پیاوماقووڵانی شار لە ئاهەنگێکی گەورەدا بەفەرمانی رەسمی شێخ موحەممەدی خاڵ دەکرێت بەپێشنوێژو مودەریسی مزگەوتەکەی باپیری تا ساڵی ١٩٣٩ لەوێ بەردەوام دەبێت، لەماوەی هەشت ساڵی دەرس وتنەوەیدا، چەندین قوتابی لای ئەو پێدەگەن و خوێندنی ئاینیی سەرکەوتووانە تەواودەکەن.

هەر لە ساڵی ١٩٣٩ دەچێتە بەغدا بۆ تاقیکردنەوەیەك کە وەزارەتی داد رێکیخستبوو بۆ پلەی قازییەتی. مامۆستا خاڵ لەو تاقیکردنەوەیەدا بە یەکەم دەردەچێت، بەفەرمانی پادشایی دەکرێتە قازی و لەهەڵەبجە دادەمەزرێت.

مامۆستای خاڵ لەشارەکانی هەڵەبجەو چەمچەماڵ و سلێمانی و کەرکوك و موصڵ قازێتی کردووە، یەکێك بووە لەقازییە ناودارو شارەزاکانی عێراق، لەماوەی (٢٨) بیست و هەشت ساڵی قازی بوونیدا.

لەساڵی (١٩٦٢) لەناو قازییەکانی عێراقدا هەڵبژێردرا بە ئەندامی محکەمەی تەمیزی شەرعی لەبەغدا، لەساڵی (١٩٦٧) خانەنشین کراوە.

جگە لەتەدریس و قازێتی شێخی خاڵ هەر لەسەرەتای لاوێتییەوە خولیای خوێندنەوەو نووسین بووە، هەر لەساڵانی سییەکانەوە دەستی بەنووسین کرد، بەرهەم لەدوای بەرهەمی پێشکەش بە هاوئایین و زمانی کرد.

مامۆستای خاڵ کەڵەزانا و رۆشنبیرو نووسەری بەتوانا بوو، بۆیە لەدوای تۆفیق وەهبی دووەم کورده لەساڵی (١٩٥٣) ببێتە ئەندامی کۆڕی زانیاری عێراق، لەساڵی (١٩٧٢) شەوە بووە بە جێگری سەرۆکی کۆڕی زانیاری کورد.

بەرهەمەکانی ئەو ساڵانەشی باشترین بەڵگەن لەسەر توانایی خزمەتی بەئایین و زمان و کەلتوری نەتەوەکەی، هەقی خۆیەتی مامۆستا لەزۆر بواری نووسیندا بەتایبەت: تەفسیری قورئان، زمان، فەرهەنگ، کەلتوردا بەپێشەنگ ناوزەدبکرێت، بەراستی بوێرانەو بلیمەتانە رچەی بۆ پاش خۆی شکاند.

ئەمانەش شاکارەکانی مامۆستای (خاڵ)ن: –

| | | |
|---|---|---|
| ١ – تەفسیری سورەی فاتیحە: | ١٩٣٢ | ٨٣ لاپەرەیە. |
| ٢ – تەفسیری سورەی فاتیحە: | ١٩٥٥ | ٣٤ لاپەرەیە. |
| ٣ – تەفسیری خاڵ، جزمی یەکەم: | ١٩٦٩ | ٢١٤ لاپەرەیە. |
| ٤– تەفسیری خاڵ، جزمی دووەم: | ١٩٧٩ | ١٩٨ لاپەرەیە |
| ٥ – تەفسیری خاڵ، جزمی سێیەم | ١٩٧٩ | ٢٢٣ لاپەرەیە |
| ٦ – تەفسیری خاڵ، جزمی چوارەم: | ١٩٨٤ | ١٦٥ لاپەرەیە |
| ٧ – تەفسیری خاڵ، سورەتی عەمە: | | |
| ٨ – تەفسیری خاڵ، جزمی تەبارەك: | ١٩٨٦ | ٢٩٧ لاپەرەیە |
| ٩ – تەفسیری خاڵ، جزمی قدسمیع الله | ١٩٨١ | |
| ١٠ – تەفسیری خاڵ، جزمی زاریات: | ١٩٩٠ | |

| | | |
|---|---|---|
| ١١– فەرهەنگی خاڵ، بەرگی یەکەم: | ١٩٦٠ | ٣٦٦ لاپەڕەیە |
| ١٢– فەرهەنگی خاڵ، بەرگی دووەم: | ١٩٦٤ | ٣٤٨ لاپەڕەیە |
| ١٣– فەرهەنگی خاڵ، بەرگی سێیەم: | ١٩٧٦ | ٤٩٦ لاپەڕەیە |
| ١٤– ناڵەی دەروون، بەرگی یەکەم: | ١٩٨٤ | ٢٣٨ لاپەڕەیە |
| ١٥– ناڵەی دەروون، بەرگی دووەم: | ١٩٨٥ | ٢٢٠ لاپەڕەیە |
| ١٦– موفتی زەهاوی: | ١٩٥٣ | ١٣٢ لاپەڕەیە |
| ١٧– پەندی پێشینان، چاپی یەکەم: | ١٩٥٧ | ١٣١١ پەندە |
| ١٨– پەندی پێشینان، چاپی دووەم: | ١٩٧١ | ٣٨٩٣ پەندە |
| ١٩– پەندی پێشینان، چاپی سێیەم: | ٢٠٠٠ | ٤٥١٣ پەندە |
| ٢٠– مەلا موحەممەدی خاکی: | ١٩٧٨ | ٦٣ لاپەڕەیە |
| ٢١– پێشگرو پاشگر: | ١٩٧٤ | ٢٤ لاپەڕەیە |
| ٢٢– باباتاهیری هەمەدانی: | ١٩٧٧ | ٣٥ لاپەڕەیە |
| ٢٣– ڕێزمانی کوردی: | ١٩٦٠ | ١٣٥ لاپەڕەیە |
| ٢٤– پەروەردەی ئایین: | ١٩٧٥ | ٢٧٠ لاپەڕەیە |
| ٢٥– ئایین و ڕەوشت و جوانکردن: | ١٩٤٩ | ٧٠ لاپەڕەیە |
| ٢٦– ها مەولودنامەی نەوئەسەر: | ١٩٣٧ | ٤٣ لاپەڕەیە |
| ٢٧– ها مەولودنامەی نەوئەسەر: | ١٩٧٢ | ٣٢ لاپەڕەیە |
| ٢٨– فەلسەفەی ئایینی ئیسلام: | ١٩٣٨ | ٦١ لاپەڕەیە |
| ٢٩– سۆزی مینبەر: | ١٩٩٧ | ٧٠ لاپەڕەیە |

**ماموستای خاڵ پاش ئەو خزمەتە مەزنانە لە ١٥/ ٧/ ١٩٨٩ ماڵئاوایی یەکجارەکیی لێکردین، خوای گەورە بە بەهەشتی بەرینی شاد بکات.**

## پێشەکی

خوێنەرانی گەلانی جیهان بەجیاوازی بیروڕاو تەمەن‌و رادەی خوێندەواری‌و پلەی کۆمەڵایەتییان، هەموو حەز لەقسەی خۆش ئەکەن. مرۆڤیش لەدێر زەمانەوە سەری قاڵە بەدابینکردنی لوقمەی ژیان، وە لەم گێژاوەدا ژیانی بردۆتەسەر.

قسەی خۆشیش جگە لەوەی کە مەردوم ئەهێنێتە پێکەنین‌و گەشانەوە لە دەم‌و روویدا بەهۆی بینین یا بیستنی شتێکی خۆشەوە، پێویستییەکیشە بۆ تەندروستی‌و درێژەدان بەژیان.

ئەگەر هەموو ئەو قسەخۆشانە لەکاتی خۆیدا کۆبکرانایەوە، وە بکرانایە بەچەند جەڵدێك کتێب، لەفەوتان رزگاریان ئەبوو، وە ئێستا ئەمانخوێندەوە، بەڕاستی ئەوە نەبێت کە ئەمڕۆ نەختێك خەم‌و خەفەت بەبابدا هیچ شتێکی تر نییە کە بای بدا. ئەگەر راستت ئەوێ حەبی ئەسپرین بۆ ژانەسەر چۆنە، ئەم جۆرە قسەخۆشانە بۆ خەم‌و خەفەتی ئەمڕۆ وانە.

لەگەڵ ئەمەم بەدڵا هات دەستێکم دا بەدەستا، هەناسەیەکی ساردم هەڵکێشا بۆ ئەو هەموو قسەخۆشانەی کەبیستووم‌ن‌و نەمنووسیبوون‌و لەبیرم چووبوونەوە. دەفتەرێکی چەند لاپەڕەییم گرت بەدەستەوەو دەستمکرد بەنووسینی ئەوانەی کە لەبیرم مابوون. کەواتە وەسیەت بێ ئەی خوێندەوارانی کورد هەروەخت قسەیەکی خۆشی پێکەنیناویتان بیست خێرا بینووسن‌و لەدەستی مەدەن، ئەمە کەلەپوورێکی زۆر بەرزو بەنرخ‌و گرنگە لەپاشەڕۆژدا. بەڵام دەخیل سەد دەخیل قسەی ناشرین مەنووسن.

**شێخ موحەممەدی خاڵ**

**١٩٨٢/٢/٢١**

### ١- پارێزگارێکی نەخوێندەوار

قازی بووم لە سلێمانی، پارێزگارێکی حقوقمان بۆ هات، رۆژی جومعان لە دیوەخان دائەنیشت بۆ ئەوەی خەڵك بچنەلای.. رۆژێکی جومعە چوومە لای، کە تەماشامکرد لەتەنیشت خۆیەوە دۆڵابێکی گەورەی کتێبی داناوە پڕە لە کتێبی جزوبەندکراوی جوان جوان، وە لەسەر دۆڵابەکە چەند کتێبێکی لەسەرشان داناوە، کە یەکێکیان ناوی کتێبەکە لە بنکەکەی بەزەڕکفت نووسرابوو، من بۆم نەخوێندرایەوە لەبەر وردی نووسینەکەی‌و دووری لێمەوە، منیش وتم: "ئەو کتێبە چییە لەسەرەوە"؟ وتی: "(حلالین)ە"، منیش وتم: "کتێبێك ناوی (حلالین) بێ نییە، ئەبێ (جلالین) بێ کە تەفسیرێکە (جلال الدين محلي) نووسیویەتی تا ناوەڕاستی قورئان‌و لەوێدا کۆچی دوایی کردووە، وە (جلال الدين سيوطي) تەواویکردووە لەسەر شێوەی پێشوو، لەبەر ئەوە ناونراوە (جلالین) واتە دوو جەلال ناو تەواویانکردووە"، ئەم زانیارییەم دایە تاوەری بگرێ، بەڵام ئەمەشی وەك دەرسەکانی حقوق وەرگرت، واتە هیچ.

### ٢- شیعە لای مەولەوی

مەولەوی شاعیر فەقێ ئەبێ لەشاری سنە لەمزگەوتی (دار الاحسان)، لەگەڵ چەند فەقێیەکی ترا، یەکێك لەو فەقێیانە شیعە ئەبێ. بەهاردێ لەرۆژێکی خۆشا، فەقێکان ئەچن بۆ سەیران لەتەنیشت گۆڕستانێکەوە شوێنێکی خۆشی پڕ لەسەوزیی‌و گوڵ‌و گوڵزار ئەبینن لائەدەن، وە لەوێ دائەنیشن‌و چا لێئەنێن‌و خواردەمەنی ئامادەئەکەن، وە بەخۆشی رائەبوێرن تا ئێوارێ. ناوبەناو مەولەوی توانجێك ئەگرێتە فەقێ شیعەکە بەپێی بیروباوەڕو عاداتی ناشیرینی خۆیان، ئەویش ناتوانێ وەرامی بداتەوە چونکە وەرامی نییە. لەو ماوەیەدا سەگێك بەسەر گۆڕستانەکەدا ئەڕوا، وەك عاداتی خۆی هەڵئەمیزێ بەکێلی قەبرێکدا. فەقێ شیعەکە چاوی تێوە ئەبێ، وە ئەمە بەهەل ئەزانێ کە ئەمیش پلارێك بگرێتە مەولەوی،

رووئەکاتە مەولەویو ئەڵێ: ئەها مەولەوی ئەو سەگە میزی کرد بەگۆڕی ئەو سوننیەدا. ئەویش کتوپڕ ئەڵێ: ئەم دوژمنایەتییە لەکۆنەوە هەیە لەنێوان شیعەو سوننیدا.

### ٣- چوار زەلامو دوو فانۆس

لەشەوێکی زستاندا دوو کەس دەمەقاڵێیان ئەبێ، یەکەمیان ئەڵێ: خێل یەك بەدوو ئەبینێ، ئەویتریان ئەڵێ: ئەم قسەیە درۆیە وانییە. ئەمانە دوو زەلام بەفانۆسێکەوە ئەنێرن بۆ ماڵی مام فەتاح ناوێك کەخێل بووە، تا ئەم پرسیارەی لێبکەن. زەلامەکان ئەچن تەقتەق لە قاپی ماڵی مام فەتاح ئەدەن وە لەخەو هەڵی ئەستێننو ئەیهێننە بەر قاپییەکە پرسیاری لێئەکەن. مام فەتاح تووڕە ئەبێ، ئەڵێ: بڕۆن بڕۆن، بەم نیوە شەوە چوار زەلامو دوو فانۆس هاتوون بۆ ئەم پرسیارە قۆڕە.

### ٤- ئەدەبی ئیمام ئەعزەم

ئیمامی ئەعزەم رەزای خوای لێبێ ئەچێ بۆ حەج، لەوسەرەوە کە ئەگەڕێتەوە ئەچێ بۆ مەدینە، رۆژێك بەتایبەتی ئەچێت بۆ زیارەتی ئیمامی مالیك، ئەویش یەکێکە لەچوار پێشەوای ئیسلام کە تائێستا یەکیان نەدیوە. کە ئەچێتە ژوورەکەی ئیمام تەماشا ئەکات پڕە لەزانایانو دانایان، وە جێگای دانیشتن نییە بەردەمی قاپییەکە نەبێ. ئیمام سەلام ئەکاو هەر لەوێ دائەنیشێ وە کەس نایناسێ. ئیمامی مالیك لێی ئەپرسێ لەکوێوە دێن؟ ئەفەرموێ لەعێراقەوە، ئیمام مالیك ئەفەرموێ: (أهل العراق، أهل النفاق) ئیمامی ئەعزەمییەش ئەفەرموێ: راست ئەفەرموون، قورئانیش پشتیوانی فەرموودەکەی ئێوە ئەکات کە ئەفەرموێ: (ومن أهل العراق مردوا على النفاق)، ئیمام مالیك پێشەکی تێنەگەیشت کە ئیمامی ئەعزەم جنێوەکەی بەخۆی دایەوە، ئیمامی مالیك فەرمووی: ئایەتەکە وانییە وەکو وتت، وتی ئەی چۆنە، وتی: (ومِن أهل المدينة مردوا علي النفاق)، لەگەڵ وتی (أهل المدينة) ئینجا تێگەیشت ئەوەی کەلەقورئاندا هەیە مونافیقی ئەهلی مەدینەیە.

کە ئیمامی مالیك خۆی مەدینەییە . نەك ئەهلی عێراقە . بەڵام ئیمامی ئەعزەم لەبەر ئەدەبی ئیمام مالیك ئایەتەکەی بەهەڵە خوێندەوە تا بەئیمام مالیك خۆی ئایەتەکە راست بکاتەوە، وە هەر بەخۆی جوابەکەی بداتەوە. ئیمام مالیك کەتێگەیشت هەستاو چووە بەردەمی وتی: ئەبێ ئێوە ئیمام ئەعزەم بن، وتی: بەڵێ، ئیتر هەڵیگرتو بردییە لای خۆیەوە.

### ٥- لە نێوان زەهاویو زەنددا

لەپێش (موفتی زەهاوی)دا موحەممەد ئەمین ئەفەندی زەند . کەزانایەکی کوردە . موفتی بەغدا بووە، کە ئەم خانەنشین ئەبێ، موفتی زەهاوی ئەبێ بەموفتی بەغدا. جارێك ئەم موحەممەد ئەمین ئەفەندی زەندە لەکۆڕێکا وتوویەتی من کوردنیم، ئەم قسەیە بەزەهاوی ئەگاتەوە، موفتی ئەڵێ: ئەبێ دایکی پێی وتبێ.

### ٦- موفتی زەهاوی نایەوێ مەیمون ببینێ

جارێکیان موفتی زەهاوی لای والی بەغدا دائەنیشێ، وە سەرینێك لەناوەندی هەردوکیانا ئەبێ، لەو دەمەدا کوڕی حەسەن قولی خانی والی لوڕستان ئەچێتە لای والی بەغدا بۆ قسەکردن لەبابەت سنوری ئێرانو عێراقەوە، وادەرئەکەوێ کەوالی بەغدا لەقسەکانی کوڕی والی لوڕستان خۆشنود نابێ لەپاش هەستانی کوڕی والی ئەمە فەرامۆش ئەکا کە موفتی زەهاوی کوردە، ئەڵێ: موفتی ئەفەندی توخوا پێم نالێیت فەرق چییە لەبەینی کوردو کەرا؟ ئەمیش خێرا ئەڵێ: فەرق لەبەرینیانا ئەم سەرینەی. والی کە بیری ئەکەوێتەوە کە موفتی کوردە زۆر شەرمەزار ئەبێ، وە داوای لێبوردن لەموفتی ئەکا، هەر لەبەر ئەمە موفتی دەست لەهاتووچۆی والی هەڵئەگرێ مەگەر لەڕەسمیاتا نەبێ. رۆژێ والی لەڕووی گلەییەوە

کاغەزێکی بۆ ئەنووسێ وە ئەم ئایەتەشی تیا ئەنووسێ کە ئەفەرموێ (أستكبرت أم كنت من العالين) واتە ئایا فیزت کرد، یا خۆت لەیەکێك لەبڵند پایەکان ژمارد. موفتیش لە داوێنی کاغەزەکەی والی بۆی نووسییەوە (لاولا) واتە نە ئیستکبارەو نەخۆبەگەورەتر دانانە.

موفتی بەدیمەن وەرامی ئایەتەکە ئەداتەوە، بەڵام لەدڵا ئاماژە ئەدا بۆ ئەو نیوە شیعرەی کە ئەڵێ: (لا أری القرد ولا القرد یرانی) واتە نەئەمەوێ مەیموون ببینمو نەمەیموون بمبینێ.

### ٧ – مەلا عەبدوڵڵای مەریوانی بە چوارپێ دەبینێ

مەلا عەبدوڵڵای مەریوانی، نووسەرو ئەدیبی بەرز، تۆزێ چاوەکانی خێل بوو، لەتەوێڵە دائەنیشت. جارێکیان بەدیدەنی ئەچێت بۆ هەڵەبجە بۆلای مەحمود پاشای جاف، مەحمود پاشا لەمیانەی قسەدا لە مەلا عەبدوڵڵا ئەپرسێو ئەڵێ: مەلا عەبدوڵڵا ئەوە راستە کە ئەڵێن: خێل یەك بەدوو ئەبینێ؟ ئەویش خێرا ئەڵێ بەڵێ راستە بەنیشانەی ئەوەی کەمن هەرچەند تۆ ئەبینم بەچوارپێت ئەبینم.

### ٨ – داود پاشاو عەمرو عومەر

داود پاشا بۆ پێکەنین رۆژێ لەموفتی زەهاوی ئەپرسێو ئەڵێ: موفتی ئەفەندی ئەوە بۆچی لەمەداریسی دینیدا میسالتان بۆ (فعلو فاعلو مەفعول) هەر (ضرب زید عمروا)ە، وە هەمیشە بەزەیدی زۆردار، لەعەمری هەژار ئەدەن؟ ئەویش کتوپڕ ئەڵێ: پاشا ئەوە لەبەر ئەوەیە کە عەمر دزە، نابینیت (واو)ێکی لەناوی ئێوە دزیوە. واتە (داوود) ئەبێ بەدوو (واو) بنووسرێ، کەچی لە رێنووسی عەرەبیدا بەیەك (واو) ئەنووسرێ، وە عەمر کە (واو)ی تیانیە، واوێکی لەپاشەوە بۆ ئەنووسرێ تا جیابێتەوە لەعومەر. داود پاش ، کە زۆر زانابووە ـ زۆری پێ خۆش ئەبێو جوابەکەی زۆر پێ جوان ئەبێ.

### ٩– شێخ رەزای تاڵەبانیو وەسمان پاشای جاف

هەموو ساڵێ لەبەهارانا شێخ رەزای تاڵەبانی چووە بۆ هەڵەبجە بۆ لای وەسمان پاشای جافو خانمی ژنی، هەشت نۆ رۆژێك لەوێ گلیانداوەتەوە، وە زۆر خزمەتیان کردووە، لەکاتی گەڕانەوەشیا پاشا لەلایەکەوە دیاریو خەڵاتو بەراتی بۆناردووەو خانم لەلایەکەوە، ساڵێکیان شێخ رەزا کە ئەچێ بۆ لایان، خانم لەماڵ ئەبێ، بەڵام پاشا لەوێ نابێ بەڵکو لەپێنجوێن ئەبێ. ئەوجارە خانم لەجاران زیاتر خزمەتی ئەکا، لەدوای چوار پێنج رۆژ شێخ رەزا بەخانم ئەڵێ: حەز ئەکەم سەرێکی پاشا بدەم لەپێنجوێن، ئەویش ئەڵێ زۆر باشە. بەیانی خانم فەرمان ئەدا وڵاخی بۆ ئامادە ئەکەن، وە دیارییەکی زۆری بۆ ئەنێرێ لەگەڵ پێنج سەد قرانا، زەلامێکیش تەرخان ئەکا کە لەگەڵیا بچێ بۆ پێنجوێن. بەیانی شێخ رەزا سوارئەبێو ئەچێ بۆ پێنجوێن، پاشا کە خەبەری ئەدەنێ زۆری پێ خۆش ئەبێو ئەچێ بەپیر شێخ رەزاوەو بەخێرهاتنێکی گەرمو گوڕی ئەکاو ئەڵێ هیوادارم کە خانم زۆر خزمەتی کردبێ، وە هیچ گلەییەکت نەبێ، شێخ رەزاش ئەڵێ نەبەخوا هیچ گلەییەکم نییە، تەنانەت خانم لەوەختی سواربوونا[1] پێنج سەد قرانیشی دامێ. پاشا دەست ئەکا بەپێکەنین ئەڵێ: دەبا بخوا خانم ئەوا حەقی خۆی وەرگرت.

### ١٠ –حەمزەی ساویلکە

پیاوێك کوڕێکی ساویلکەی ئەبێ، هەمیشە لەگەڵ خۆیا ئەیگێڕیو قسەی فێرئەکاو هەستانو دانیشتنی نیشان ئەدا، بەرۆژ لەگەڵ خۆی ئەیبرد بۆ بازاڕ. رۆژێ لەرێی بازاڕ کوڕێکیان لەپێشەوە ئەبێ ناوی عەبدوڵڵا ئەبێ، یەکێك لەپشتەوە

---

[1] شێخ رەزا بۆ پێکەنین لە رستەی (لە کاتی سواربوونی وڵاخەکەدا)، تەنها وشەی (سواربوونا)ی هێشتۆتەوە.

بانگی ئەکا عەبدوڵڵا عەبدوڵڵا سێ چوارجار لەسەر یەك ئەو کوڕەش ئاوڕ ئەداتەوە ئەڵێ: (کلنا عبیدالله فأی عبد ترید) واتە ئێمە هەموو عەبدی خواین، کام عەبدت مەبەستە بیڵێ. کە ئەم کوڕە ئەم جوابە جوانە ئەداتەوە، باوکی کوڕە ساویلکەکەش بەکوڕەکەی خۆی ئەڵێ: تەماشای ئەم کوڕەکە بزانە چ جوابێکی جوانی دایەوە.

ئەم کوڕە ساویلکەیە ناوی حەمزە ئەبێ، لەدوای چەند رۆژێك یەکێکیش ئەم کوڕە بانگ ئەکا ئەڵێ: حەمزە حەمزە، ئەمیش وەك هاوڕێکەی پێشوو ئەڵێ: (کلنا حمامز الله فأي حمزة ترید) باوکەکەی لەتەنیشتیەوە ئەڵێ: ئەی خوا موبارەکی نەکا بۆ خۆت و ئەم دەرزەی کە بۆت وەرگرتووم.

## ١١- زاناو شێخەکان لەقورئاندا

لەزانایەکی ژیری رۆشنبیریان پرسی ئەوە بۆچی قورئان لەزۆر لاوە ناوی زانایانی سروشت (طبیعة) ئەبا کەچی جارێك ناوی شێخ نابا؟ خێرا ئەویش ئەڵێ: بەڵێ، ناوی شێخیش ئەبا، ئەوە نییە ئەفەرموێ (هل یستوي الذین یعلمون والذین لایعلمون) الذین یعلمون زاناکانن، والذین لایعلمون شێخەکانن.

## ١٢-میمی (فإنّ)

لەساڵی (١٩٣١-١٩٣٢)دا دەنگ بڵاوبوو کە مەعاش ئەبڕێتەوە بۆ چەند مەلایەك، بەم بۆنەیەوە چوار پێنجێك لەمەلا باشەکان کۆئەبنەوەو سکاڵانامەیەك بەعەرەبی ئەنووسن و بەشێخێکی مێزەر بەسەری نەخوێندەوارا سکاڵانامەکەیان نارد بۆ سەید ئەحمەدی عازەبانی کە کاتب بوو لەسەرادا، بەم بۆنەیەوە کە گوایا ئەو شارەزاترە لەنووسینی سکاڵانامەدا، تا بزانن سکاڵانامەکەیان باش نووسیوە، وە کەمو کوڕیی هەیە یان نا، کە سکاڵانامەکەی هێنایەوە، وتی: سەید ئەحمەد ئەڵێ: باشە بەڵام میمی (فإنّ)کەی لەجێی خۆیا نییە، مەلاکان وتیان: کوا (فإنّ) میمی تیایە، وتی: ئەبێ تیابێ.

## ١٣- سەردانەکەی شێخ رەزاو شێخ عەلی برای بۆ بەغدا

شێخ رەزای تاڵەبانی لەگەڵ شێخ عەلیی کاکیا ئەچن بۆ بەغدا میوانی نەقیبی بەغدا ئەبن، بەوبۆنەیەوە مەلاو خوێندەوارانی بەغدا ئەچن بۆ لایان. شێخ عەلی لەکۆڕی نەقیبا بە موناسەبە زۆر فەرموودەی پێغەمبەر ئەخوێنێتەوە کە یەکێکیان ئەم فەرموودەیە ئەبێ کە ئەڵێ: (دع مایریبك الى ما لایریبك) واتە هەرچی گومانت تیابوو، بەم رەنگە بڕوات نەبوو بەحەڵاڵیی ئەوشتە، دەستی لێهەڵبگرە، وە دەست بەرە بۆ شتێك کە بەحەڵاڵی بزانیت و گومانت تیانەبێ. یەکێك لەمەلا گەورەکانی بەغدا ئەڵێ: ئەم فەرموودەیە لە (رابَ یَریبُ)وە هاتووە نەك لە (أرابَ یُریب)، خێرا شێخ رەزا ئەڵێ: (إنکم لَفي شكٍ مریب)، واتە ئێوە لەگومانان، وە بۆخۆتان شكو شوبهە پەیدائەکەن. ئەم وەرامی شێخ رەزایە دوو مەعنای هەیە، یەکەم: واتە قسەکەتان جێی باوەڕ نییەو جێی گومانە. دووهەم: وتەی (مریب) لە (اراب یریب)و وەکە پشتیوانی قسەکەی شێخ عەلی تاڵەبانی ئەکات.

## ١٤- فەتاح بێ و ترخێنە نەخوا

پیرێژنێك تاقە کوڕێکی ئەبێ ناوی فەتاح ئەبێ، زۆر حەزی لەچێشتی ترخێنە ئەبێ، فەتاح نەخۆش ئەکەوێ، چەند رۆژێ کەم کەم بۆی ئەکەوێ، لەپاشا سەرومڕ لێی ئەکەوێ. دایکی زۆر بەدەوریا دێ بەڵام کوڕە رۆژ بەرۆژ خراپرتر ئەبێ، رۆژێ دایکی تەماشائەکا فەتاح زۆر کەشەنگە وە هیچی پێ ناخورێ، خێرا ئەچێ ترخێنەیەکی تایبەتی بۆ لێئەنێ بەدۆشاوی تەماتەو گۆشت و کفتەی وردو کشمیش و گوێزو چەوەندەرو ئەیباتە بەردەمی کە تۆزێکی بخوا، فەتاح هەر تەماشای ئەکاو دەستی بۆ نابا. دایکی ئەڵێ بەقوربانت بم بۆچی تۆزێکی لێناخۆیت؟ فەتاح ناتوانێ وەڵامی بداتەوە،

دایکی بەهەردوو دەستی ئەماڵیٚ بەسەری خۆیا ئەڵیٚ: ئای ماڵم وێرانبیٚ فەتاح بیٚ ترخێنە نەخوات. لەو رۆژەوە ئەم رستە (جملە)یە بووە بەپەند، بەیەکێك ئەوتریٚ ئەو شتەی کەجارن حەزی لێبووە ئێستا نەیەویٚ.

### ١٥- ئیسلامەتی جوولەکەیەکی سلێمانی

جوولەکەیەك بووە لەشاری سلێمانی لەسەرەتای سەدەی سیانزەهەمی کۆچیدا کە پێی وتراوە (عەبەدیا)، یەکێك بووە لەپیاو ماقووڵانی ئەم شارە، ئەم جوولەکەیە زۆر هاتوچۆی شێخەکانی سلێمانی کردووە، نەخوازەلاٚ هی شێخ مستەفای نەقیب. رۆژیٚ شێخ مستەفا پێی ئەڵیٚ: خاڵە عەبەدیا تۆ کە ئەمەندە دۆستو خۆشەویستی ساداتی بۆ مسوڵمان نابیت؟ ئەویش کتوپڕ ئەڵیٚ: بەخوا ئەگەر ئیسلامەتی وەك کاك ئەحمەدی شێخە، ئەوە بەمن ناکریٚ، وە ئەگەر وەك ئێوەشە ئەوا هینەکەی خۆم باشترە.

### ١٦- دەی خواحافیزت نەبیٚ

رۆژی هەینی بوو، لەمزگەوتەکەی خۆمان – مزگەوتی شێخ ئەمینی خاڵ – دانیشتبووین لەگەڵ ئەحمەدو مستەفای برامو مەلا موحەممەدی کوڕی حاجی مەلا مستەفای کوردی. تۆزێکی پیٚ چوو جەلال صائیبیش . بەڕەحمەت بیٚ . هات، دانیشتین تا نزیك نوێژی جومعە، زۆر بەخۆشی رامان بوارد. مەلا موحەممەد هەستا کە دەستنوێژ بشوا بۆ جومعەو بێتەوە ناومان، بەلاٚم من وامزانی کە بەئێجگاری ئەڕوا وتم: مەلا موحەممەد خواحافیزت بیٚ، مەلا موحەممەد وتی: ناڕۆم دەستنوێژ ئەشۆمو دێمەوە. جەلال ئەفەندی وتی: دەی خواحافیزت نەبیٚ.

### ١٧-مەلا موحەممەدی کۆیەو دەروێشەکە

خواڵخۆشبوو مەلا موحەممەدی کۆیە زۆر رقی لەدەروێشو سۆفۆو شێخەکانیان بوو، رۆژێك دەروێشێك ئەچێتە لای، مەلا موحەممەدیش بەخێرهاتنی ئەکاتو پێی ئەڵێت: ماڵت لەکوێیە؟ دەروێشیش ئەڵیٚ: قوربان ماڵی دنیاییم ئەفەرموی یا ماڵی قیامەتیم؟ مەلا موحەممەدیش ئەڵیٚ: کەرە ماڵی قیامەتیت بێگومان جەهەننەمە، پرسیارت لیٚ ئەکەم لەچ دێیەك دائەنیشیت.

### ١٨- نەخۆشی نەوت

لەساڵی (١٩٧٤)دا شۆڕشی مەلا مستەفای بەرزانی بوو، هیچ لەسلێمانی دەست نەئەکەوت، نەشەکر، نەچا نەخواردەمەنی. ئەو زستانە لەزستانە ساردەکان بوو، بەرمیلیٚ نەوت چووبووە سی دینار، ئافرەتیٚ زەبوونی هەناسە سارد بەیانی ئەچوو بۆ نەوتخانە بۆ تەنەکەیەك نەوت، ئێواریٚ بەنائومێدی ئەگەڕایەوە. لەو ساڵەدا حاجی ئەحەڕەش . بەڕەحمەت بیٚ . نەخۆش کەت، بردیان بۆ بەغدا، دکتۆر پێی وت: حاجی نەخۆشی شەکرەتە، ئەبیٚ ئاگات لەخۆت بیٚ، حاجی ئەحمەد لەخۆشیانا کەوا شەکر دەست ناکەویٚو ئەم نەخۆشی شەکرەیەتی دەستیکرد بەپێکەنین وتی: خۆزگە نەخۆشی نەوتیشم ئەبوو.

### ١٩- فەرموو..! عافێتت بیٚ...

مەلا مەعصوم مەلایەکی زۆر باش، وە خوێندەوارێکی بەرزو بالاٚبوو لەفارسیو هەموو جۆرە وێژەیەکدا، خوێندنی هەمووی لای خوالێخۆشبوو مەلا موحەممەدی کۆیەدا بووە. بەیانییەکیان نەختیٚ درەنگ خەبەری ئەبێتەوە، کە ئەچیٚ بۆ ئاودەست تەماشا ئەکات وا هەموو ئاودەستێکی مزگەوت دوو سیٚ کەس لەبەردەمیا وێستاوە ئەمیش بەناچاری لەبەردەمی ئاودەسێکا ئەوێسیٚ، کابرا کە لەئاودەسەکە دێتە دەرەوە، ئەو زەلامەی کە لەپێش ئەما وێستابوو لەبەر حورمەتی مەلا مەعصوم پێی ئەڵیٚ: فەرموو، مەلا مەعصومیش ئەڵیٚ: عافێتت بیٚ.

## ٢٠ – ساله شێت و شێخ قادری حەفید

ساله شێت هەموو جارێ ئەچوو بۆلای شێخ قادری حەفید، شێخ قادریش پارەی ئەدایەو ئەیلاوانەوە. لەم دواییەدا ساله زۆر تێکچووبوو لەبەر ئەوە دادگا ناردی بۆ خەستەخانەی شێتان لەبەغداد، لەدوای ماوەیەك شێخ قادر ئەچێ بۆ بەغدا لەوێ ساله شێتی بیرئەکەوێتەوە وە ئەچێ بۆ لای کە پارەی بداتێ، لەوێ کە ساله ئەیبینێ ئەڵێ: شێخ قادر ئەوە تۆیشیان هێناوە بۆ ئێرە؟

## ٢١ – کەرەو هەنگوین دەخوات

موفتی عەبدولعەزیزو شێخ باباعەلی مودەریس و مەلا حسەینی پسکەندی بەدیدەنی ئەچن بۆ لای حاجی مەلا سەعیدی کەرکوکلی زادە، بەرێکەوت مەلا سەعید هەنگوین و کەرە ئەخوات بەنانەوە،

موفتی لێی ئەپرسێ حاجی مەلا ئەوە چی ئەخۆی؟ خێرا شێخ بابا عەلی ئەڵێ: کەرەو هەنگوین ئەخوات. حاجی مەلا سەعید ئەڵێ: ئەگەر خراپەت مەبەست نییە بۆ ناڵێی هەنگوین و کەرە ئەخوات.

## ٢٢ – جنێوەکەی مەولەوی بۆ سەیدەکان

مەولەوی –بەرەحمەت بێ – جارێکیان دێ بۆ سلێمانی، رۆژێ ئەچێ بۆ زیارەتی کاك ئەحمەدی شێخ، لەپاشا لەوێ هەڵئەسێ و ئەچێ بۆ لای یەکێك لەشێخەکان، کە ئەچێ تەماشا ئەکا وا زۆر لەسەییدەکان لەوێ مۆڵن، وە بە کۆمەڵێی قسە لەوە ئەکەن کە ژنی ئەم عالەمە بۆ سەیید حەلاڵە، وەك مەلایەك لەخۆیان ئەم فتوایەی بۆ داون، مەولەویش لەقسەکە واقی ورئەمێنێ، کە چۆن ئەبێ مسوڵمان ئەمە بیروباوەری بێ، لەکاتێکا کە قورئان شاهیدە بەسەرمانەوەو شەریعەت پایەدارە لەناومانا. ئەمیش هەروا گوێیان لێئەگرێ تا لێئەبنەوە، ئینجا لێیان ئەپرسێ ئەڵێ: ئەمەی وتتان هەروەك بیروباوەری خۆتانە، ئایا بیروباوەری ژنەکانیشتانە؟ ئەوانیش هەموو بێدەنگ ئەبن، وە لوتیان ئەچووزێتەوە، ئەم قسەیە بەکاك ئەحمەد ئەگاتەوە. کاك ئەحمەد بانگیان ئەکاتە لای خۆی و زۆریان لێ توورە ئەبێ، وە پێیان ئەڵێ: ئێوە تاکەی دەست لەم قسە ناشیرینە هەڵناگرن، نەخوازەلا کە زانایەکی وەك مەولەویش حازربێ، وە ئەم جنێوە پیسەتان پێبدا.

## ٢٣ – دەستنوێژەکەی حاجی ئەحمەدی کوڕنوو

حاجی ئەحمەدی کوڕنوو پیاوێکی زۆر قسەخۆش و زیرەك بووە، ئەچێ بۆ حەج لەپێش زیاتر لەسەد ساڵ لەمەوپێشا، لەو سەفەرەدا رێی ئەکەوێتە شوێنێك وەختی نوێژ ئەبێ، ئەیەوێ دەستنوێژ بشواو نوێژ بکا، شوێنێکی نیشان ئەدەن لوولینەی ئاوی زۆری لێئەبێ، ئەمیش دەست ئەداتە لوولینەیەك ئەیبات بۆ سەر ئاودەست، دوو لوولینەش ئەبا دەستنوێژی پێ ئەشوا، کە لێئەبێتەوە لە دەستنوێژەکە، خاوەن لوولینەکە داوای پارەی ئاوەکەی لێ ئەکا، ئەمیش سەری سوورئەمێنێ، چونکە لەکوردستانەوە چووە کە هەمووی کانیی و کارێزو تاڤگەو چەم و رووبارو ئاوی ساردو ساف و سازگارەو ئەڵێ: چۆن ئاو بەپارە ئەفرۆشرێ؟ خاوەنی لوولەکانیش ئەڵێ: لێرە وایە بەبێ پارە ئاو نادەین. وادیارە حاجی ئەحمەدیش پارەی پێ نەبووە، لەبەر ئەوە قنگێك ئەکاتە کابراو ترێکی بۆ ئەکەنێ، ئەڵێ: ئەوە خۆت و دەستنوێژەکەت.

## ٢٤ –مۆرەکەی شاکر

سەید ئەحمەدی خانەقا – بەرەحمەت بێ – بۆیگێرامەوە وتی: شێخ مستەفای کوڕی شێخ عەبولسەمەدی قازی پیاوێکی زانای دانادیدەو شاعیری قسەخۆش بوو، هەموو ساڵێك پایزان و بەهاران دەعوەتم ئەکرد، جاری هەشت نۆ رۆژ ئەمایەوە لام بەقسەی خۆش رامان ئەبوارد، رۆژێ دوای عەسر لەخانەقا دانیشتبووین، وە میوانێکی زۆرمان لەلا

دانیشتبوو، شاکرە ئەفەندی ناوێکی تەقاویتی عەسکەری بوو، ئەویش لەناویانا بوو، باسی خەتخۆشی کرا، شاکرە ئەفەندی وتی: ئەو دەمەی کە لەئەستەمبوڵ بووم خەتخۆشێك لەنزیك بارەگای خەلافەتەوە بوو، مۆری هەڵئەکەند پیتی بەلیرەیەك، واتە ناوەکە چەند پیت بووایە ئەوەندە لیرەی ئەسەند. لەپاشا ئەڵێ: من مۆرێکم پێ هەڵکەند بەچوار لیرە، مۆرەکە دەرئەهێنێ و ئەیداتە دەست سەید ئەحمەد، سەید وتی: منیش تەماشامکرد خەتەکە زۆر خۆشبوو، وە دوای من هەروا دەست بەدەست لەلای راستەوە وەریانگرت، ئەم بەوو ئەو بەم، تا هاتە سەر شێخ مستەفا کە لەتەنیشتی لای چەپمەوە دانیشتبوو. شێخ مستەفا هەر لێی وردئەبووەوەو بزە ئەیگرت، زانیم کە قسەیەکی خۆشی پێیە، ئاخریەکەی درکاندیو وتی: بەخوا کەرەکەی کەری چاکە.[1]

## ٢٥- ( خس ) بوو بە ( حسن )

هەر ئەم شاکر ئەفەندییە گێراویەتییەوە بۆ سەید ئەحمەد، کە من بەدیار مۆرەکەی خۆمەوە دانیشتبووم یەکێك هات بۆلای مۆرهەڵکەنەکە کە مۆرێکی بۆ هەڵکەنێ، ئەویش لێی پرسی ناوت چییە؟! وتی ناوم (خس)ە، مۆرهەڵکەنەکە وتی: خس چییە؟ وتی: بە عەرەبی بە مەعنا کاهووە، وتی باشە. مۆرەکەی من تەواوبوو، پارەکەمدا، بەڵام مامەوە تا بزانم ئەم خسە ئەبێ بە چی، کە مۆرەکە تەواوبوو، وە هاتە سەرئەوەی نوقتەی سەر (خێ)یەکە دابنێ، کابرا بە مۆرهەڵکەنەکەی وت: تکا ئەکەم نوقتەی (خێ)کەن لەناو ماڵی (سین)ەکەدا بۆ دابنێ. کە نوقتەی بەوجۆرە دانا، تەماشایکرد ناوەکە بووە بە (حسن) کە سێ پیتە، وە کابرا لیرەیەکی زەرەرکرد.

## ٢٦- ژنهێنانی کاکە مەلا

کاکە مەلا کابرایەکی زرتەبۆزی، ملهوڕی، چوارشانەی، کەتەی، تێکسمڕاوی داڕێژراوبوو، لەتەمەنی (٢٥) ساڵیدا ژنێکی جوانی، شەنگو شۆخو باڵا لاولاوی ناوقەد باریك ئەهێنێ. دوای شەش حەوت مانگ رابواردنو کەیف کردن، مەلا ئەحمەد – بەڕەحمەت بێ– بەکاکە مەلا ئەگاو ئەحواڵ پرسییەکی گەرمو گوڕی لەگەڵ ئەکاو پێی ئەڵێ: خوا یاربێ بەمزووانە زاڕۆڵەیەکی زیرەکمان ئەبێ. کاکە مەلاش ئەڵێ: نەبەخوا هیچمان بەدەستەوە نییە، مەلا ئەحمەد ئەڵێ: چی چی، ئەوە ئەڵێیت چی، ئەویش ئەڵێ: بەخوا هیچمان دیار نییە، مەلا ئەحمەد ئەڵێ: بەخوای ئەرزو ئاسمان وام نەزانی بوو، کەچی وادیارە سنگ شێری ماکەر پشتیت.

## ٢٧ -میراتییەکەی شێخ مەعروف

لەپێش ئەوەی خوالێخۆشبوو شێخ عومەری قەرەداخی بچێتە سەر خانەقای مەولانا خالید بەیانیان ئەچووم بۆ خزمەتی دەرسی ئیستعارەی مەلا ئەبوبەکرم لا ئەخوێند، لەکاتی دەرسەکەدا هەستم پێئەکرد کە کەیف خۆش نییە، منیش لێم پرسی کە ئەمڕۆ خەفەتێکت هەیە، وتی بەخوا راست ئەکەی کاکم شێخ مەعروف نەخۆشە بچۆ بۆلای ئەحواڵێکی بپرسە، منیش هەستام چووم بۆ هۆدەکەی تەماشامکرد خشتێکیان بۆ گەرمکردووە لەسەری دانیشتبوو، وە خشتێکی تریان بۆ گەرمکردووە پاڵی پێوە ناوەو خاولییەکیشیان بۆ گەرمکردووە ناویەتیە سەر سکی، منیش ئەحواڵ پرسیم کردو وتم ئەوە چ خێرتە؟ وتی: سکم ئێشێ، هەموو مانگێك جارێ یا دوو جار تووشی ئەم سکیەشەیە ئەبم، لەپاشان بەخەمو خەفەتێکەوە وتی: خەڵقی ئەمرێ ئاوبارەو بەکرەجۆ بەجێدێڵێ بۆ مناڵەکانی، من باوکم مردووە سکیەشەی بەکەلەپوور بۆ بەجێهێشتووم، قسەکەیم ئەوەندە پێخۆشبوو نیازم بوو دەست بکەم بەپێکەنین، بەڵام خۆمگرت هەرچەندە هەستیشی پێکرد.

[1] واتە کافو رێی ناوەکە، کە شاکرە ـ زۆر جوانە، بەڵام بەمجۆرەی دارشت تا نیشان بدا کە مۆرێك بۆچی ئەبێ چوار لیرەی زێڕی پێ بدرێ.

### ٢٨ – شێخ یونس...... فص

شێخ یونس ناوێك بووە لەسلێمانی پیاوێكی تووڕەو بەسەزمان بووە، هەرچەندە لەماڵ هاتبێتە دەرەوە منداڵان دوای كەوتوون بەشێخ فص شێخ فص، ئەم پێی وتووە: شێخ یونس فص، ئەو پێی وتووە شێخ فص. ئەمیش تووڕە بووەو جنێوی پێ داون. وادیارە كاك ئەحمەدی شێخ . بەڕەحمەت بێ . بەزەیی پیا هاتۆتەوە. رۆژێك شێخ یونس ئەچێت بۆ لای كاك ئەحمەد، كاك ئەحمەدیش بەسەریا دێ ئەڵێ: یاشێخ تۆ بۆ لەقسەی ئەو منداڵانە تووڕە ئەبیت وە خۆت بۆ دڵگیر ئەكەیت، من بم لەجیاتی تۆ جواب نادەمەوە، شێخ یونسیش بەدەنگی بەرز هەشت نۆ جار بەكاك ئەحمەد ئەڵێ: كاك ئەحمەد فص، كاك ئەحمەد فص، كاك ئەحمەد فص. كاك ئەحمەد تووڕە ئەبێو ئەڵێ: من ئەڵێم چیو تۆ ئەڵێیت چی، ئەویش ئەڵێ: قوربان تۆ بەسێ چوار جار تووڕە بوویت، من لەسەد لاوە سەد جارم پێ ئەڵێن چۆن تووڕە نابم؟ كاك ئەحمەد بێدەنگ ئەبێ.

### ٢٩ –دوعاكەی شێخ خراپتری كرد...!

ئافرەتێك منداڵێكی ئەبێ هەموو شەوێك میز ئەكات بەخۆیا، دایكەكەی هەرچەندە داودەرمانی ئەداتێ بێكەڵك ئەبێ، لەپاشا ئەیباتە لای شێخێكو كەللەیەك شەكریشی سەرقەڵەمانە بۆ ئەباو پێی ئەڵێ: ئەم منداڵە هەموو شەوێك میز ئەكات بەخۆیا، هێناومە كە دوعایەكی بۆ بنووسی تا چاك ببێ. شێخەكەش دوعایەكی بۆ ئەنووسێ، ژنەكە دوعاكە لەمشەمائەگرێو ئەیدروێ بەشانی منداڵەكەدا، شەو منداڵەكە ئەنوێو دایكی بەتەمای ئەوە ئەبێ كە منداڵەكە میزی نەكردبێ بەخۆیا، بەڵام بەیانی كە منداڵەكە هەڵئەستێ لەخەو دایكە تەماشائەكا وا لەگەڵ میزەكەدا گوشی كردووە بەخۆیا، دایكەكە ئەدا بەسەری خۆیاو پەلەپەل منداڵەكە هەڵئەگرێو ئەیباتەوە لای شێخەكە، ئەڵێ: بەقوربانت بم ئەمشەو لەگەڵ میزەكەدا گوشی كردووە بەخۆیا، وا هێناومە دوعایەكی تری بۆ بنووسە وەكو جارانی لێ بێتەوە.

### ٣٠ –سەگو گورگەكەی حاجی مەلا جەلال

حاجی مەلا جەلالی كوڕی مەلا حەسەنی ئابلاخ بوو پیاوێكی بەسەزمانو گێلۆكە بوو، هەرچەند لەگەڵ شێخ مستەفای شێخ مەعروفی قەرەداغیو شێخ موحەممەدی خەتیبا كۆببوایەتەوە زۆر گاڵتەیان پێ ئەكرد نەخوازەلا شێخ مستەفا. رۆژێكیان حاجی مەلا جەلال وە دوو سێ مەلای تر لەوێ ئەبن، مەلا جەلال لەپەنجەرەی ژوورەكەوە تەماشا ئەكا وا شێخ مستەفاو خەتیبیش هاتن بۆ ئەوێ، ئەویش لەژێر لێوەوە ئەڵێ: وا سەگو گورگەكان هاتن، یەكێك لەمەلاكان گوێی لێ ئەبێ كە شێخ مستەفاو خەتیب دێنە ژوورەوە دائەنیشن مەلاكە ئەڵێ: بەخوا سكی من عەماری كەس نییە ئێوە كە هاتنو لەدوورەوە دەركەوتن حاجی مەلا جەلال وتی وا سەگو گورگەكان هاتن. شێخ مستەفا دەست ئەكا بەپێكەنینو بەمەلا جەلال ئەڵێ: بەخوا وابزانم سەگەكە منم، مەلا جەلالیش پێئەكەنیو ئەڵێ بەخوا راست ئەكەی ئافەرین شێخ مستەفا بۆ خۆتو زیرەكیت.

### ٣١ – هێلكەكانی رەشۆڵو قایمقام

رەشۆڵی دەنگخۆش موتەعەهیدی یانەی فەرمانبەران ئەبێ لەشەستەكانی سەدەی رابردوودا، نادی هێلكەی لێ ئەبڕێو ئەچێ بۆ لای قایمقامی مەركەزی سلێمانیو داوای (٣٠) تەبەق هێلكەی لێ ئەكاو پێی ئەڵێ: ئەندامانی نادییەكە هەموو شەوێك داوای هێلكەو رۆنو مێخلەمەو ئەمجۆرە خواردەمەنیانەم لێئەكەن، ئەویش نایداتێ. رەشۆڵ بەدڵگیری هەڵئەسێو ئەڕوا. دوای مانگێك رەشۆڵ سەرێكی رەئیسی صحە ئەدات لەخەستەخانە تەماشا ئەكات قایمقام لەوێ دانیشتووە،

**ئەویش تۆزێ دائەنیشێو ئەیەوێ پلارێ بگرێتە قایمقام، رووئەکاتە رەئیسی صحەو ئەڵێ: جاران قایمقام ئیشی زۆر گرنگی بەدەستبوو، وەك ئەگەر دوو تیرە بچوونایە بەگژیەکدا سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران لەبەغدا تەلەفونی ئەکرد بۆ قایمقام کە بچێ ئەو دوو تیرەیە ئاشت بکاتەوە، ئەویش ئەچوو ئاشتی ئەکردنەوەو چەکی پێ دائەنان. بەڵام قایمقامەکان ئێستا بەهێلکە فرۆشتنەوە سەریان قاڵە.**

### ٣٢-مەولانا خالیدو دەمكوتكردنی شێخ عەلی سویدی

حەزرەتی مەولانا خالیدی نەقشبەندی كە سلێمانی بەجێهێشت چوو بۆ بەغدا بەئێجگاریی نەهاتەوە، لەویٚ زۆر بەرێز بووە، بچوایەتە هەر كۆڕێكی گەورەوە دانیشتووانی ئەو كۆڕە هەموو رووویان تێئەكرد. رۆژیٚ لەرۆژان مەولانا ئەچیٚ بۆ تەعزیێەكی زۆر گەورە، كە ئەچیٚ شێخ عەلی سویدی لەویٚ ئەبیٚ وەعز ئەخوێنیٚ بۆ دانیشتووانی ئەو تەعزیێە، وە خەڵقەكە هەموو رووویان تێكردووەو گوێیان بۆ گرتووە. كاتیٚ كە مەولانا دەرئەكەویٚ هەموو هەڵئەستن لەبەری رووئەكەنە ئەو، شێخ عەلی لەمە زۆر قارس ئەبیٚ، وە ئەیەویٚ مەولانا بشكێنیٚ لەو كۆڕەدا، رووئەكاتە مەولانا ئەڵیٚ: جەنابی شێخ زۆر لەعولەمای كوردی ئەمرۆ دەستورو عادەتێكی زۆر ناشیرین‌و خراپیان هەیە، كە لەسەرەتای خوێندنیانەوە تا مردنیان هەر خەریكی فەلسەفەو حیكمەتی یۆنانی ئەبن، وە تا ئەمرن ئاوڕێك نادەنەوە بەلای قورئان‌و فەرموودەی پێغەمبەرەوە، بەپێچەوانەی زانایانی عەرەب، كە ئەمان تا مردن هەر خەریكی قورئان‌و فەرموودەی پێغەمبەرن. مەولاناش ئەڵیٚ: بەڵیٚ وایە وەك فەرمووت، بەڵام بەداخەوە هەردوولا هەر بۆ راوی دنیاو پایەو ناونیشان ئەخوێنن، هیچیان بەو خوێندنە خواو رۆژی دوایی مەبەس نییە، ئینجا كەوابوو راوی دنیا بە (قال الله وقال رسول الله) زۆر ناشیرینترە لەراوی دنیا بە (قال ئەفلاتوون‌و قال ئەرەستۆ). بەڵیٚ ئەگەر هەردوولا مەبەستیان بۆخوابیٚ كردەوەی بەشی زۆری برا عەرەبەكانمان باشتر ئەبوو. بەم وەرامە دەمكوت ئەبیٚ وە ئیتر دەم ناكاتەوە تا هەڵئەسیٚ ئەڕوا.

ئەم دەمەقاڵییە زۆر بەپێزە. سەید مەحمودی ئالوسی، خاوەنی تەفسیری (روح المعاني) ئەیگێڕێتەوە لەكتێبی (نزهة الألباب)یا، وە لەداوێنی داستانەكەوە زۆر پەسەندی مەولانا ئەكا لەسەر ئەم بەرگرییەی كە كردوویەتی بەدوو وتەكە ئەڵیٚ: (ما أغيره وأغوره) واتە تەماشاكەن تا چەند بەغیرەتە، وەتا چەند قسەكەی قووڵە.

### ٣٣-كتێبەكەی بن باخەڵی شێخ رەسوڵ

لەدەوروبەری ساڵی (١٢٤٠)ی كۆچی لە سلێمانیدا شێخ رەسوڵ ناوێك بووە، مەلایەتییەكی مامناوەندی بووە، بەڵام خۆی بەمەلایەكی زۆر بەرزو بڵند زانیوە، هەمیشە كتێبێكی شەرحی گولنبوی لەبن چنگا بووە، بەهەرلایەك گەیشتبیٚ دەستی ئەكرد بەپرسیارلێكردنی. رۆژێكی هەینی تووشی موفتی زەهاوی ئەبیٚ لەحەوشی مزگەوتی گەورەدا. كە هەرچی مەلاو خوێندەواری شاری سلێمانی بووە لەویٚ بووە . دەست ئەكا بەپرسیارلێكردنی، ئەویش دەست ئەكا بەوەرامدانەوەی، نەپرسیارێك نەدوو نەسیٚ، چی پرسیاری لێئەكا موفتی زەهاوی خێرا وەرامی ئەداتەوە، لەپاشا ئەوێستیٚ، ئینجا زەهاوی پرسیارێك لەو ئەكا پەكی ئەكەویٚ، وە بەم بۆنەیەوە زەهاوی ئەم شیعرە هەڵئەدا بەسەریا كەنیوەی فارسی‌و نیوەی كوردییە، وە لەشێوەیەكی گاڵتەپێكردنایە، ئەڵیٚ:

شەرحی گولنبوی در بَغَل، با خەلق میازد جەدەل
چوون خەربمانەد دەر وەحەل، ئوز نەینی بگرەو باریكە

واتە كتێبێكی شەرحی گولنبوی لەبن باخەڵایە، بەهەر مەلایەك بگا پرسیارێكی لێئەكا، كەچی پرسیارێك لەخۆی بكەیت وەك كەر لەقوڕا ئەچەقیٚ، ئەو حەلە هەردوو گوێی بگرەو باریكە.

### ٣٤- پارێزگاری سلێمانی‌و شێخ قادری حەفید

مەعروف جیاووك پارێزگاری سلێمانی بوو، وە چووبوو بەگژ شێخ قادری برای خوالێخۆشبوو شێخ مەحمووددا، وە هەر رۆژە نەرۆژیٚ شێخ قادر سكاڵانامەیەكی بەهێزی لەپارێزگاری سلێمانی ئەدا بەوەزارەتی ناوخۆ لەبەغداد. خێرەومەندانیش بەپارێزگاریان ئەوت: ئەم سكاڵانامانە ئەحمەدی عەزیز ئاغا بۆ شێخ قادری ئەنووسی، پارێزگاریش لەدڵا زۆر رقی لە ئەحمەدی عەزیز ئاغا هەستابوو، بەڵام هێشتا بەتەواوی ئەم قسەیەی بۆ ساغ نەبووبۆوە. رۆژیٚ حاجی سەعید ئاغا ئەچیٚ

بۆ سەرا بۆ لای پارێزگار، لەپاشا کە هەڵئەستێ بەبەردەمی ژوورەکەی ئەحمەدی عەزیز ئاغادا ئەگەڕێتەوە، کە ئەگاتە بەرقاپی ژوورەکەی ئەحمەد، قاپییەکە ئەکاتەوەو سەرێك ئەباتە ژوورەوە ئەڵێ: ئەحمەد رۆڵە تۆ بۆ نایەڵیت شێخ قادرو پارێزگار ئاشتیان بێتەوە. ئەحمەدی عەزیز ئاغا راست ئەبێتەوە ئەڵێ: حاجی ئاغا بۆ خاتری خوا من ئێستا وەك کەڵەشێری لۆقەنتە وام، لەهەر کاتێکا سەرمبڕن سەرم ئەبڕن، من بەرگەی ئەم قسەی ناگرم کە تۆ پێم ئەڵێیت، من دەخڵم چییە بەسەر ئەم نەهەنگانەوە کەوا شەڕە چەقۆیانە.

### ٣٥- (میاو)ەکەی ئەحمەدی عەزیزئاغا

ئەحمەدی عەزیز ئاغا . بەرەحمەت بێ . پیاوێکی ناسراوی خۆشەویستی قسەخۆش بوو لەشاری سلێمانیدا، قسەخۆشەکانی بەسەر زمانی هەمووانەوە بوو، رۆژێکیان لەدوای دەوامی دائیرە دێتە ماڵێ، ژنەکەی بەلەمێك یاپراخی پڕ لەگۆشتو بەزو پەراسوو ئەخاتە بەردەمی و دەست ئەکا بەخواردنی. پشیلەیەکی ماڵییان ئەبێ بۆنی یاپراخەکە ئەکاو دێتە بەرامبەر ئاغاو دەست ئەکا بەمیاواندن. ئاغاش پارچەیەك گۆشتی بۆ هەڵئەدا پشیلەکە ئەیخواو دەست ئەکاتەوە بەمیاواندن، پارچەیەکی تر گۆشتی بۆ فڕێ ئەدا ئەیخواو ئەڵێ میاو، ئەمجارە پەراسوویەکی بۆ هەڵئەدا، ئەیخواو ئەڵێ میاو. ئاغا هەر فریای ئەوە ئەکەوێ گۆشتو بەز پەراسووی بۆ هەڵدا، تا ئاغا هەراسان ئەبێ. وا دەرئەکەوێ نسیبی پشیلەکە لەگۆشتو چەوری و پەراسوو زیاتربێ لەنسیبی ئاغا. ئەحمەدی عەزیز ئاغا ناچار بە پشیلەکە ئەڵێ: فەرموو وەرە جێگەکەم و من میاو.

### ٣٦- رەوتەنییەك لەنێوان سورەتی (البقره)و (فیل) دا

ئەگێڕنەوە کە رەوتەنییەك دەمەو بەیان ئەگاتە شارێك، لەمزگەوتێکەوە بانگ ئەدرێ، ئەمیش ئەچێتە مزگەوتەکە بۆ دەستنوێژگرتن و نوێژکردن، دوای دەستنوێژگرتن مەلا دێ و جەماعەت دائەبەسترێ، مەلا دوای فاتیحە دەست ئەکا بەخوێندنی سوورەتی (البقرة) کە دوو جزمو نیوە، وە (٢٨٦) ئایەتە، دوای هەتاوکەوتنێکی درەنگ لەنوێژەکەیان ئەبنەوە. کابرای رەوتەنی زۆر هیلاك ئەبێ، لەیەکێك ئەپرسێ ئەڵێ: ئەم سوورەتە درێژە چی بوو کەمەلا خوێندی، وە دوو سەعاتی پێچوو؟ ئەڵێ: سوورەتی بەقەرە بوو. کابرا دوای چەند رۆژێك ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆی بەڵام داخی ئەو نوێژەی هەر لەدڵا ئەبێ. دوای چەند ساڵێکی تر کابرا دووبارە رووئەکاتەوە ئەو شارە، وە دەمەوبەیان ئەگاتەوە شارەکەو مزگەوتەکە، وە ئەچێتە ژوورەوەو دەستنوێژ ئەگرێ و نوێژەکەی بەجەماعەت دائەبەستێ. ئیمام دوای فاتیحە دەست ئەکات بەخوێندنی سوورەی (الفیل) وە ئەڵێ: (الم تر کیفَ فَعلَ ربُّكَ بأصحاب الفیل) کابرا کە گوێی لەناوی فیل ئەبێ خێرا نوێژەکەی ئەبڕێ، وە لەدڵی خۆیا ئەڵێ چەند ساڵێك لەمەوپێش بە سێ سەعات ئەم نوێژەی بەیانییەمان کرد، وە لەدەست سوورەتی (بقرة) رزگارمان بوو، ئەمجارە بەشەش سەعات لە سوورەتی فیل رزگارم نابێ، لەگەڵ ئەویشە کە پێنج ئایەتی بچکۆلانەیە.

### ٣٧- لێزانی فەقێکان

لەباپیرم بیست فەرمووی لەکاتی عەبدوڕڕەحمان پاشای باباندا[١] مزگەوتەکانی سلێمانی فەقێی زۆریان تیابووە. مانگی رەمەزان دێ فەقێکان تەماشائەکەن لەنانی رەق زیاتر هیچێکی وایان نییە کە بەربانگو پارشێو بیخۆن، دوو سێیەکیان دائەنیشن دوو شیعری فارسی رێك ئەخەن و بۆی ئەنێرن ئەڵێن:

ماهی رمضان آمدو مارارەم ئەزانت

[١] ئەم عەبدالرحمن پاشایە زانایەکی دینی زۆر پایەبەرز بووە لەو زانینەی کە لەو رۆژەدا لەمزگەوتەکانا خوێنراوە، وەخۆی ئەم مزگەوتەی کە ئێستا پێی ئەڵێن مزگەوتی سەید حەسەن دروستیکردووە.

مارارەم ئەزانیت کە ماه رمضانت

مارا رەم ئەزانت کە ماه رەمضان نت

در حجر نەنانت و نەئابت و نەچایی

عەبدوڕڕەحمان پاشا کە شیعرەکان ئەخوێنێتەوە بەچێشتکەری ماڵی خۆی ئەڵێ: نووسەرێك لەگەڵ خۆت هەڵگرەو بچۆ بزانە سلێمانی چەند مزگەوت و هەر مزگەوتێك چەند فەقێی تیایە، ناویان و ژمارەیان بنووسن، وە ئەم مانگی رەمەزانە بەسێ رۆژی جەژنەوە هەموو ئێوارەیەك و پارشێوێك لەو خواردنەی کە بۆ من ئەکرێ سینییەك یان دوو سینی زۆر چاك بنێرە بۆ فەقێی ئەو مزگەوتانە. ئەو سی و سێ شەوە عەبدوڕڕەحمان پاشا چیی خواردووە، ئەو فەقێیانە ئەو خواردەمەنییەیان خواردووە بەتێرو تەسەلی.

## ٣٨- گەمژەیەك نوێژی جومعە پەك دەخات!

دێهاتەکانی کوردستان زۆریان لەهاویندا جومعەیان تیا ناکرێ، چونکە پیاوەکانی هەموو ئەچنە سەر کشتوکاڵ و باخ و باخاتیان، وە چل کەسی تیانامێنێتەوە تا جومعەیان پێ تەواوببێ، بەڵام لەزستانانا بەشی زۆری دێهاتەکانی جومعەیان تیائەکرێ چونکە زەلامەکانی هەموو لەماڵەوەن، هەروەك دێهاتی واشیان هەیە کە چوار فەسڵە جومعەیان تیائەکرێ، لەم دێهاتانە جومعەیەکیان (٣٩) کەس کۆئەبنەوە، وە لەسەر زەلامێك جومعەکەیان پەکی ئەکەوێ، مەلاکەیان پەلەپەلی پێئەکەوێ بۆ تاقە زەلامێك، لەبەر ئەوە ئەچێتە سەربانی مزگەوتەکەو بەهەرچوارلادا ئەڕوانێ بۆ یەکێك کە بە دیی بکات و جومعەکەیان لەگەڵ بکات. لەدوای ماوەیەك لەدوور زەلامێك ئەبینێ، بانگی ئەکاو جبەکەی بۆ رائەوەشێنێ، کابرا دێ بەدەنگییەوە ئەڵێ: مەلا چیت ئەوێ؟ مەلاش ئەڵێ هەموو جومعەیەك جومعەمان کردووە، ئەم جومعەیە (٣٩) کەسین، لەسەر زەلامێك پەکمان کەوتووە، تۆ وەرە با ببین بەچل کەس و جومعەکەمان بکەین، کابرا ئەڵێ: ئەی بە (٣٩) کەس جومعە ناکرێ؟ مەلا ئەڵێ: نەء، ئەبێ چل کەسبین، کابرا ئەڵێ: ئێستا ئەگەر من نەیەم ئەم جومعەیە پەکی ئەکەوێ؟ مەلا ئەڵێ: بەڵێ، کابرا ئەڵێ: دە بەخوا من نایەم، مەلا ئەڵێ: بۆچی؟! کابرا ئەڵێ: چونکە تا ئێستا هەزاران جار لەئیشێك پەکم کەوتووە، وە داوام لەخوا کردووە کە بۆم جێبەجێ بکا، بۆی نەکردووم، ئەمجارە خوا ئەم ئیشەی کەوتۆتە من، بەخوا منیش بۆی ناکەم، با جومعەکەی پەکی بکەوێ، وە کابرا لووس و باریك ئەگەڕێتەوە و ئەڕوا.

## ٣٩- مانگا ئیزرائیلەکە

پیرەژنێك تاقە کچێکی ئەبێ زۆری خۆش ئەوێ، کچە نەخۆش ئەکەوێ دایکەکەی ئاگری تێ بەرئەبێ، شەوو رۆژ بەدیارێوە ئەبێ خزمەتی ئەکا. کچە رۆژ بەرۆژ ئەپووکێتەوە، وە بێ رەنگ و بێ کەیف ئەبێ، وە ئارەزووی خواردن و خواردنەوەی نامێنێ، دایکە ئەکەوێتە هەڵپەو پەلەپەل، دەمێ ئەچێ بۆلای شێخ و مەلا نوشتە بۆ کچەکەی ئەنووسن، دەمێ ئەیبا بۆ سەر قەبری مەشایخ و پیاوچاکان شەفاعەتی بۆ بکەن، دەمێ بۆ لای پزیشك. بەڵام هەمووی بێکەڵك بوو. کچە رۆژ بەرۆژ ئەپووکایەوە وەك مۆمێك کە لەکوژانەوەدابێ. دایکە هیچی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێ کە خۆی بکا بەبالاّ گەردانی. بەیانی سەبای ساڵحان دایکە ئەچێتە ژووری کچەکەی حەوت جار خۆی بەدەوریا ئەگێڕێ و ئەپاڕێتەوە لەخوا کە بیکا بەقوربانی، وە هەر بەلاّیەك بۆ ئەو دێتە خوارەوە لەچوار پەلی ئەم کەوێ. لەو کاتەدا کە دایکەکە خۆی ئەگێڕێ بەدەوری کچەکەیا، مانگای یەکێك لەدراوسێکانی دێتە حەوشەی ماڵەکەی ئەم، وە دیزەیەکی قاورمە کە خاڵی بووە، لەگۆێ حەوز دانراوە بۆ شتن، مانگاکە سەری پیائەکاو ئەیلێسێتەوە. دایکەکە دوای خۆگێڕان بەدەوری کچەکەیدا دێتە دەرەوە، لەتەقەی پێی ئەم مانگایە، کە سەر بەرزئەکاتەوە سەیرئەکا دیزەکە لەسەری و لەشاخەکانی ترنجاوە، ژنەکە چاوی بەم دەعبایە ئەکەوێ، وا ئەزانێ کە ئەمە ئیزرائیلەو بۆ گیانی ئەم هاتووە کەوا خۆی گێڕاوە بەدەوری کچەکەیا، خێرا پەشیمان ئەبێتەوە، وە بەمانگاکە ئەڵێ: بەقوربانت بم نەخۆشەکە ئەوەتا لەژوورەوە، وە بەهەردوو دەستیشی ئاماژەی بۆ ئەکا.

**٤٠- بەبۆنەی باسی ریشەوە چەند شیعرێکی شێخ رەزای تاڵەبانیو چەند شاعیرێکی تر هەن کە زۆر جوانن لێرەدا ئەیان نووسین.**

**شێخ رەزا لە هەجووی حەمەی وەستا فەتاحدا ئەڵێ:**

**هەزار ئەفسوونو جادووی پێوە ئاوێزانە ئەم ریشە**
**عیلاجی گەر ببێ یا گوێزە یا گوێزانە ئەم ریشە**
**بەتەحریکی تەڵێکی سەد هەزار نەفسی بەکوشتندا**
**رەئیسی حیلەکاران، شای قوماربازانە ئەم ریشە**
**بەبای سەرسەرِ لەشوێن خۆی ناجمێ، ریشی ئەمەند سەختە**
**بەبێ حیکمەت نییە گەر جار بەجار لەرزانە ئەم ریشە**
**بە ظاهیر سافە وەك زیوی سپی، ئەمما لە باطندا**
**رەشو پیسو مولەووەس، وەك بنی قازانە ئەم ریشە**
**بەمەکرێ ئەم رەتێنێ حەزبکا هەر لێرە تا موکریی**
**پەناهمەدەی خودایا، خاوەنی زۆرزانە ئەم ریشە**
**کە سەیرمکرد دەزانم شێخ لەمن مەسرووره یا عاجز**
**حەمەی وەستا فەتاح بۆ ماڵی من میزانە ئەم ریشە**
**هەزار هەوسارو دەستبەندو گوریسی لێ دروست ئەکرێ**
**بەسەد باتمان خوریی گەر دەستکەوێ هەرزانە ئەم ریشە**[1]

**٤١- هەر لەزەمی حەمەی وەستا فەتاحا ئەڵێ:**

**حەمەی وەستا فەتاح سەد بارك الله لەم سەرو ریشە**
**کە گوێدرێژی بەتەنها چۆن ئەبا ئەم بارە قامیشە**
**لەسەد باتمان خوریی زیاتر نەبێ کەمتر نییە وەزنی**
**سەرت چۆنی هەڵئەگرێ من سەرم سوورِماوە لەم ئیشە**[2]

**٤٢- شێخ ئیسماعیلو بەرماڵی کۆڵی تانجییەکە**

**لەباپیرم بیستووە ئەیفەرموو: باوکم هەموو جارێ ئەیگێرِایەوە کە شێخ ئیسماعیل ناوێك بووە لەگەرەکی گۆیژە لەنزیك مزگەوتی خۆمانەوە، پیاوێکی پیر بوو، دوو سێ کورِی گەورە گەورەی بوو، رۆژێك شێخ ئیسماعیل ئەچێتە ماڵەوە تەماشائەکا وا تانجییەك لە حەوشەکەیا بەسراوەتەوە، لەکورِەکانی ئەپرسێ ئەمە چییە؟ ئەوانیش ئەڵێن: تانجی راوە،**

[1] دیارە مەبەستی شێخ رەزا پلارگرتنە لە حەمەی وەستا فەتاح نەك ریش، چونکە شێخ رەزا خۆییو بنەماڵەکەی ریشی درێژیان هەبووە.

[2] بە هەمان شێوەی پێشوو مەبەستی شێخ رەزا پلارگرتنە لە حەمەی وەستا فەتاح نەك ریش.

کرپومانە راوی پێئەکەین. ئەویش تووڕە ئەبێ ئەڵێ: ئەم سەگە گلاوە، نابێ لەم ماڵی مندا بێ، ئەوانیش ئەڵێن: بابە ئەمە کەروێشکو ئاسکمان بۆ ئەگرێو گۆشتەکەیان ئەخۆین، شێخ ئیسماعیل هەر ئەڵێ: نابێ لەم ماڵەدا بمێنێتەوە، ئەوانیش بەقسەی ناکەن. شێخ ئیسماعیل ئەتۆرێ ئەچێ بۆ مزگەوت، شەوو رۆژێ لەمزگەوت ئەمێنێتەوە، سبەینێ کوڕەکان ئەچن بۆ راو سێ کەروێشکی گەورەی قەڵەو ئەهێننەوە، خێرا دەست ئەکەن بە کەوڵکردنو پاککردنیو گۆشت برژاندن، ماڵ پڕئەبێ لەبۆنی گۆشتی برژاو، ئینجا یەکێك لەکوڕەکان ئەچێ بەشوێن باوکیا، باوکی ئەڵێ سەگەکە ماوە لەماڵەکەدا؟ ئەڵێ نەء، ئەڵێ: دە باشە، تۆ بڕۆ وامنیش دێمەوە. شێخ ئیماعیل لەمزگەوت دێتە دەرەوە، بۆنی گۆشتی برژاوی بەسەرا ئەچێ، زۆر ئارەزووی گۆشت ئەکا، چونکە شەش مانگە گۆشتی نەخواردووە، رووئەکاتە ماڵی خۆیان تەماشائەکا بۆنی گۆشتەکە لەماڵەکەی ئەوانەوە دێ، باوەڕ ناکا کە ئەوە ماڵی خۆیانە، پاشەوپاش دێتە دواوە، قاپی دراوسێکان هەموو ئەژمێرێ، تەماشا ئەکا هەموو لەجێی خۆیانن، هەر ئەمەیان ماوەتەوە کەماڵی خۆیانبێ، بەڵام هەرچەند ئەکا زات ناکا بچێتە ژوورەوە، بەناچاری بانگی کوڕە گەورەکەی ئەکا، کوڕە دێ بەدەنگێوە، کە تەماشائەکا وا باوکی لەبەر قاپییەکە وێستاوە، ئەڵێ: بابە بۆ نایەیتە ژوورەوە؟ ئەڵێ: ئەمە ماڵەکەی ئێمەیە؟ ئەڵێ: بەڵێ، ئەڵێ: ئەی ئەم بۆنی گۆشتی برژاوو چزو هوڕە چییە؟ ئەڵێ: تۆ وەرە ژوورەوە چاوت بەکاری خوا بکەوێ، کە ئەچێتە ژوورەوە ئەبینێ وا پڕ لەگەنێکی گۆشتی برژاو، پڕ لەگەنێکی تریش گۆشتاوێکی زەردو زۆڵی چەوری پڕ لەگۆشت دانراوە لەگەڵ ناندا، شێخ ئیسماعیل ئەڵێ: ئەمەتان لەکوێ بوو؟ ئەڵێن: بابە ئەمە بەتانجییەکە راومانکردووە، ئەڵێ: توخوا، ئەڵێن: بەخوا، خێرا دوو پارچە گۆشتی برژاو ئەنێتە دەمیو هەڵئەستێ بەرماڵەکەی سەرشانی خۆی . کە راستو چەپ دابووی بەسەر شانیا لەسەرمانا . دایئەگرێو ئەیبا ئەیگرێتە کۆڵی تانجییەکەوە گرێی ئەداو ئەڵێ: با ئیمشەو سەرمای نەبێ، تا بەیانی جلێکی بۆ ئەکەم. کوڕەکان هەموو دەستئەکەن بەپێکەنین.

## ٤٣- بۆ بۆیاخی ریشی سمێڵیشی نایەبانی

سەید هیدایەت – بەرحمەت بێ – بۆی گێڕامەوە، وتی دراوسێی شێخێکی ریش پان بووم، لەجیاتی زانینو زانیارییو پەخشانو هۆنراوەو خواپەرسی هەر خەریکی ریشی بوو،شەوو رۆژ دەستی تیابوو، دەمێ لەخەنەو وسمەی ئەگرتو دەمێ بەسابوونی بۆنخۆش ئەیشت، وە دەمێ دەقی ئەکردو دەمێ بەشانە دایئەهێنا. سەید وتی سەفەرێکی بەغدام کەوتەبەر. ئێوارە لای شێخ درکاندم کە سبەینێ ئەچم بۆ بەغداد، شێخ فەرمووی سەید زۆر تکات لێئەکەم شووشەیەکی بۆیەی ریشم بۆ بکڕە، روپییەیەکیشی دامێ بۆ بۆیەکە. رۆژێ بەتایبەتی لەبەغدا چووم بۆ کڕینی بۆیەکە، لەسەر دوکانێك پرسیم وتم: بۆیەی ریشت هەیە؟ وتی: بەڵێ، وتم: بەچەند؟ وتی: بەروپیەو نیوێك، وتم: نەء بەروپیەیەك، وتی: لەوە کەمتری نییە، وتم: کوڕە بۆ شێخێکی ریش پانم ئەوێ، تاقە روپیەیەکی داومێ خێرت ئەگا بەروپیەیەکە بمدەرێ، وتی: نایدەم، زۆرم چەقە چەق لەگەڵ کرد بێکەڵك بوو، جولەکەیەك دراوسێی بوو بانگی کردم وتی: وەرە من ئەتدەمێ، منیش چوومە لای جولەکەکەو روپییەکەم دایە شووشەیەکی دامێ، تومەز ئەم شووشەیە داڕووە، کە موو هەڵئەوەرێنێ، منیش بردمەوە بۆ شێخ، شێخ زۆری پێخۆشبوو. شەو وەختی نووستن دەرمانەکە ئەهێنێو زۆر جوان ئەیدا لەریشیو سمێڵیو برۆو لاجانگی، لەپاشا لەچکێك ئەکاو ئەچێتە ناو جێگاوە ئەنوێ، بەیانی هەڵئەستێ، کە لەچکەکە ئەکاتەوە دەستێك بەریشیا ئەهێنێ هەرچی ریشو سمێڵی هەیە هەمووی بەدەستیەوە دێو ئەکەوێتە خوارەوە. شێخ هەناسەیەکی سارد هەڵئەکێشێ، هیچی پێناکرێ جنێودان نەبێ بەسەید هیدایەتی بێ گوناه. بەیانی ماڵو منداڵ کە هەڵئەستن تەماشائەکەن بنباخەڵێك ریشو سمێڵ لەو ناوەدا کەوتووە، شێخیش بەبێ ریشو سمێڵ لەلایەکەوە مات دانیشتووە، زوخاو لەدڵی ئەتکێ. بەو چلەی هالوینە شێخ لەچکێك ئەکاو لەماڵەکەی خۆی ئەچێتە کونی ژوورەوە، نەوەك یەکێك ببینێ بەبێ ریشو سمێڵ، خۆلاسە شەش حەوت ماگ لەماڵ نەهاتەدەرێ، نەکەسی دیو نەکەس چاوی بەو کەوت، هەرچیش ئەحواڵی ئەپرسی ئەیان وت نەخۆشە.

### ٤٤- به‌ریتانیا نایه‌وێت كورد به‌ مافی خۆی بگات

مێجه‌ر ئه‌دمۆنس سی ساڵ موسته‌شاری وه‌زاره‌تی ناوخۆ بوو له‌عێراقدا، هه‌موو ساڵێ ئه‌هات بۆ كوردستان گه‌شتێكی ئه‌كرد، وه‌ هه‌موو پیاوێكی گه‌وره‌و خوێنده‌وارانی ئه‌ناسی. كه‌ سی ساڵه‌كه‌ی ته‌واوكرد هات بۆ سلێمانی، مه‌عروف جیاووك . به‌ره‌حمه‌ت بێ . پارێزگاری سلێمانی بوو، به‌وبۆنه‌یه‌وه‌ ده‌عوه‌تێكی كرد بۆ نانخواردن له‌گه‌ڵ ئه‌دمۆنسدا كه‌ یه‌كێكیان من بووم، ئه‌حواڵی فه‌رهه‌نگی خاڵی لێپرسیم وتی: له‌چیدایه‌، وتم: له‌ته‌واوبوونایه‌، وتی: ده‌ستوبردی لێبكه‌ به‌ڵكو به‌مزووانه‌ له‌چاپی بده‌یت. وتم: خوا یاربێت.

له‌پاشا گه‌ڕایه‌وه‌ بۆ له‌نده‌ن به‌یه‌كجاریی. له‌ساڵی ١٩٥٥دا حه‌ماغای عه‌بدوڕڕه‌حمان ئاغا چوو بۆ له‌نده‌ن به‌نه‌خۆشی، له‌وێ مێجه‌ر ئه‌دمۆنس چووبوو بۆ لای و ده‌عوه‌تی كردبوو بۆ نانخواردن له‌ماڵی خۆی. له‌وێ بۆ حه‌ماغای گێڕابووه‌وه‌ كه‌ له‌پاش گه‌ڕانه‌وه‌ بۆ له‌نده‌ن، كاغه‌زێكی دوورو درێژی نووسی بۆ وه‌زیری خارجییه‌ی به‌ریتانیا كه‌ گه‌لی كورد گه‌لێكی (٢٥) ملیۆنییه‌، وه‌ خاوه‌نی فه‌رهه‌نگه‌ وه‌ گه‌لێكی ئازای زیره‌كی به‌وه‌فای تێگه‌یشتووی دانایه‌، وه‌ تا ئێستا ماوه‌ته‌وه‌ بێ ئه‌وه‌ی به‌مافی خۆی بگا، ئه‌مرۆ رۆژی ئه‌وه‌ هاتووه‌ كه‌ به‌ریتانیا ده‌ست بداته‌ باڵی و یارمه‌تی بدات تا ئه‌گاته‌ ئامانجه‌كانی. مێجه‌ر ئه‌دمۆنس ئه‌ڵێ : كه‌ وه‌زیری خارجییه‌ كاغه‌زه‌كه‌ی منی پێگه‌یشت خێرا بروسكه‌یه‌كی دامێ كه‌ بچم بۆ لای ببینم. له‌پاشا ئه‌ڵێ: كه‌چووم بۆلای، وه‌زیر لێم تووڕه‌بوو وتی: تۆ بۆچی كاغه‌زی وا بۆمن ئه‌نووسیت؟ نازانیت كه‌ ده‌وڵه‌تی به‌ریتانیا له‌كۆنه‌وه‌ بڕیاری داوه‌ كه‌ هه‌رگیز یارمه‌تی گه‌لی كوردنه‌دا.

### ٤٥- چوارینه‌كه‌ی شێخی حوسامه‌دین و ئه‌حمه‌د هه‌ردی و من

ئه‌حمه‌دی هه‌ردی . یادی به‌خێر . بۆی گێڕامه‌وه‌ وتی له‌ساڵی ١٩٤٥ مامۆستا بووم له‌دێی گوڵپ له‌بناری هه‌ورامان، له‌و دێیه‌دا یه‌كێكی ژیری خوێنده‌وار هه‌بوو كه‌شێخ موحه‌ممه‌دی كوڕی شێخی حوسامه‌ددین بوو كه‌ خانووبه‌ره‌یه‌كی گه‌وره‌ و باخێكی پرته‌قاڵی بوو، هه‌موو ساڵێ به‌لۆری پرته‌قاڵی ئه‌نارده‌ هه‌ڵه‌بجه‌ ئه‌یانفرۆشت. منیش به‌وبۆنه‌یه‌وه‌ ناوبه‌ناو به‌شه‌و ئه‌چووم بۆلای شێخ موحه‌ممه‌د، وه‌ چه‌ند سه‌عاتێك له‌گه‌ڵیا به‌قسه‌ی خۆش ئه‌مانبرده‌سه‌ر. له‌م مه‌یدانه‌دا چاوم به‌كه‌شكۆڵێك كه‌وت له‌لای، كه‌ له‌كاغه‌زێكی تورمه‌ی ئاوریشم نووسرابووه‌وه‌ به‌ده‌ستنووسێكی زۆر خۆش و جوان، وه‌ پێنج شه‌ش هه‌زار شیعری كوردی و فارسی و عه‌ره‌بی تیانووسرابووه‌وه‌، بێگومان (١٥٠٠ تا ٢٠٠٠) شیعری مه‌وله‌وی تیانووسرابوو، به‌كوردی كه‌ بۆ شێخی سیراجه‌دینی نووسیبوو، وه‌ جوابه‌كه‌ی شێخیشی تیانووسرابووه‌وه‌، هه‌روا شیعری زۆری تیابوو كه‌ بۆ شێخ به‌هادین و شێخ عه‌بدوڕڕه‌حمان و حاجی شێخ ئه‌حمه‌دی كوڕی شێخ سیراجه‌دین نووسرابووه‌وه‌ و وه‌ڵامی ئه‌مانیشی تیابوو بۆ مه‌وله‌وی، هه‌روه‌ها زۆر شیعری تری تیابوو بۆ كه‌سانی تر كه‌ ئه‌مانه‌ هیچیان له‌دیوانه‌كه‌یا تۆمارنه‌كرابوون. پرسیم ئه‌م كه‌شكۆڵه‌ هی كێیه‌؟ شێخ موحه‌ممه‌د وتی: هی شێخی باوكمه‌ بۆ یه‌ك دوو حه‌فته‌ لێم وه‌رگرتووه‌. منیش هه‌روا تكامكرد له‌ شێخ موحه‌ممه‌د كه‌ بۆ چه‌ند شه‌وێك بمداتێ بۆ ئه‌وه‌ی به‌وردی ته‌ماشای بكه‌م، منیش كه‌ته‌ماشامكرد كه‌شكۆڵه‌كه‌ زۆر به‌نرخه‌ وه‌ زۆر شتی تیابوو كه‌ له‌شوێنێكی تر نه‌بوو، وه‌ بینیم كه‌ شێخ حوسامه‌دین . ره‌زای خوای لێبێ . چوارینه‌یه‌كی فارسی له‌زۆر شوێن له‌و كه‌شكۆڵه‌دا به‌ده‌ستنووسی خۆی تۆماری كردبوو. تێگه‌یشتم كه‌ شێخی ناوبراو ئه‌م چوارینه‌یه‌ زۆر كاری تێكردووه‌ بۆیه‌ وا له‌زۆر شوێن نووسیوویه‌تییه‌وه‌. ئه‌حمه‌د هه‌ردی وتی: منیش چوارینه‌كه‌ هه‌رچه‌ند فارسی بوو، وه‌ فارسییم باش نه‌ئه‌زانی وه‌رمگرت و تێگه‌یشتم و له‌به‌رمكرد. چوارینه‌كه‌ ئه‌مه‌یه‌:

گیره‌م كی فه‌له‌ك هه‌م ده‌م و هه‌م سازایه‌د
ناسازیی ده‌هر ده‌ر سه‌رم سازایه‌د
یارانی موافق زكوجا جمع شه‌وه‌ند

وین عمری گزشته از کوجا بازایەد

ئەحمەد هەردی کە ئەم شیعرەی دامێ بەڕاستی زۆر کاریکردە سەر هەستو هۆشم، وە باش حاڵی بووم کە کاتو دەم بەپرتاو دێتو دەڕوا، وە بەهەزاران دۆستو ئاشنا ئەمرنو خۆیان ئەشارنەوە، وە جارێکی تر نایان بینینەوە تا لەپڕ خۆشمان ئەمرین، وە بەم بۆنەیەوە منیش چوارینەکەم وەرگرتو کردم بەکوردی ئەڵێم:

گیرەم رۆژگار بەدڵی من ئەبوو

ناڕێکی دەوران رێكو پێك ئەبوو

یارانی هاودەم لەکوێ بێنمەوە

عەمری رابردوو چۆن بگێڕمەوە

### ٤٦- مانگی رۆژوو

وا ئەمساڵیش مانگی رۆژوو نزیك کەوتەوە، ئەگەر مەردووم هەر خەفەتی گرتنەکەیان لێهاتبێ، من خەمی گرتنەکەشیو کردنەکەشیم لێهاتووە.

جارێ پێشەکی یەکەم شەوی رۆژوو کەس بۆ مانگ ناگەڕێ، وە ئەگەر بیشی بینن کەس نایەتە مەحکەمە شەهادەت بدا، زۆر جار بیستوومە کە زۆر کەس مانگی دیوەو خۆی بەڕۆژوو بووە، کەچی یەکەم شەو لای کەس باسی نەکردووە بۆ ئەوەی پێی نەڵێن بچۆ شەهادەت بدە. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە لە کەرکوك یا لە هەولێر یا لە بەغدادەوە بروسکەیەك بە ئیمزای قازییەوە دێ کە لەوێ مانگ بینراوە، وە شەرعەن رەمەزان سابت بووە. ئەگەر ئەیکەی بە رەمەزانو رێنادەی رۆژێکی لێبخورێ، لە هەموو لایەکەوە بەناوی شەرعەوە دەست ئەکەن بە قسەکردن، ئەوە چۆن کرا بە رەمەزان؟! لە زەمانی پێشوودا بە بروسکە تەلەفۆن نەئەکرا.. بەڵێ، راستە چونکە ئەو حەلە بروسکەو تەلەفۆن نەبووە، وە ئەگەر نایکەی بە رەمەزان ئەوا سبەی ئێوارێ مانگ دوو شەوە ئەبێ، ئینجا دەس ئەکەن بە دەهۆڵ لێدان کەوا لەمسەری رۆژێکی لێخورا، خوا کەریمە لەو سەریش رۆژێکی لێبخورێو ئەم مانگەش (٢٩) بێ ئیتر ئەمێنێتەوە (٢٧) رۆژی.

ئەگێڕنەوە قازییەك سێ رەمەزان لێرەبووە، رەمەزانی یەکەم، رەمەزانەکەیان (٣٠) رۆژ بووە، رەمەزانی دووەم (٢٩) رۆژ بووە، رەمەزانی سێیەم مانگ نەبینراوەو لەم سەر رۆژێکی لێ خواردووەو رەمەزانەکەش (٢٩) بووە ماوەتەوە (٢٨) رۆژی! ئینجا بەم بۆنەیەوە کەوتوونەتە بەندو باو، وتویانە ئەگەر ئەم قازییە (٢٧) ساڵی تر لێرە بمێنێ.، رەمەزان رۆژێکی نامێنێ. باشە ئەوا رۆژووەوانەکان بە هەرجۆر، ئەی بێ رۆژووەکان دەخڵیان چییە بە سەرەوە؟! ئەم مەسەلەیە مەسەلەیەکی عیلمیو دینییەو ئەگەڕێتەوە بۆ قازی، ئایا قازی شەرع لە ئیشوکاری ئێوەدا هەڵئەداتێ تا ئێوەش هەڵبدەن لە ئیشوکاریا.[1]

### ٤٧- سوڵتان عەبدولحەمید لەستایشی ( پیرەمێرد )دا

ئەگێڕنەوە لە ساڵی (١٩٠٠) سوڵتان عەبدولحەمید شێخ سەعیدی حەفید بانگ ئەکا بۆ کۆشکی خۆی لە ئەستەمبوڵ، شێخ سەعیدیش دە پانزە کەس لە زاناو داناو نووسەرو پیاو ماقووڵانی سلێمانی لەگەڵ خۆیا ئەبات کە یەکێکیان (حاجی مەلا عەلی کانی کەوەیی)و یەکێکیان (پیرەمێرد) بووە. کە ئەگەنە ئەستەمبوڵ سوڵتان عەبدولحەمید چەند پیاو ماقووڵێکی کۆشك ئەنێرێ بە پێشوازییانەوە، وە ئەیانبەنە (دۆڵمە باخچە سی) کە کۆشکی تایبەتی سوڵتان بوو بۆ میوانداری. بەیانی کە ئەچن بۆ لای سوڵتان لە پێشەوە ئەیانبەن بۆ باشکاتبی مابەین (کە ئێستا پێی ئەڵێن سکرتێر). باشکتاب لە شێخ سەعید ئەپرسێو ئەڵێ: کوا ئەو نووسەرەتان کە بە بروسکەیەك سوڵتان عەبدولحەمیدی راکێشایە سەر تەلەفۆن کردن بۆ

[1] شێخی خاڵ لە ناوەڕاستی چلەکانەوە تا ١٩٦٧ قازی بووە لە سلێمانی تەنها چوار ساڵی لێدەرکە کە قازی بووە لە کەرکوكو موصلو ئەندامی مەحکەمەی تەمیزی شەرعی لە بەغداد.

شێخ سەعید بۆ سلێمانیو هەموو لایەکمانی سەرسام کرد، شێخ سەعیدیش پەنجە رائەکێشێ بۆ (پیرەمێرد) ئەڵێ: "ئەوەیە ئەو نووسەرە". باشکتاب هەڵئەسێ تەوقەی لەگەڵ بکات، پیرەمێردیش هەڵئەسێ بە کەوایەکی شۆڕو سەڵتەیەکی کورتو جووتێ فەقیانەی درێژو کڵاوو جامانەیەکەوە. باشکتاب زۆر سەرسام ئەبێ ئەڵێ: "ئەمەیە ئەو نووسەرە!"

***

لە باوکمم بیستووە کە هەر لە زەمانی سوڵتان عەبدولحەمیددا یەکێك لە هاوڵاتیانی حوکمی عوسمانی کە کوردێکی خەڵکی سلێمانی ئەبێ (بەداخەوە ناوەکەیم لەبیر نەماوە) حوکمی لە سێدارەدانی ئەدرێ لە ئەستەمبوڵ. کەسوکاری تاوانبارەکە ئەچن بۆ ماڵی شاعیرو نووسەری گەورەی کورد (پیرەمێرد) لە شاری سلێمانی، تکای لێ ئەکەن کە نامەیەك بنووسێ بۆ سوڵتانو تکای لێ بکا کە سزای لەسێدارەدانی لەسەر لاببرێ. (حاجی تۆفیقی پیرەمێرد)یش بەقەڵەمە رەنگینەکەیو توانا بەرزەکەی لە نووسینیدا، نامەیەکی جوانی پڕ مانا بە زمانی تورکی ئەنووسێ بۆ سوڵتان عەبدولحەمیدو بە کەسوکاری تاوانبارەکەدا ئەینێرێ بۆ سوڵتان لە ئەستەمبوڵو داوای لێئەکات کە بیبەخشێ.

سوڵتان کە نامەکە ئەخوێنێتەوە سەری سووڕئەمێنێ لەبەر بەلاغەتو جوانی ناوەڕۆکی نامەکە. دەستبەجێ باشکتابی مابەین بانگ ئەکاتو ئەڵێ: "ئەم حاجی تۆفیقە کێیە؟" ئەویش ئەڵێ: "ئەمە نووسەرو رۆژنامەچییەکی کوردەو حقوقییەو ئەندامی مەجلیسی عالی بووە لە ئەستەمبوڵ". سوڵتانیش ئەڵێ: "کوردێك بتوانێ نامەیەکی وا رەنگینو پڕ مانا بە تورکی بنووسێ، شایانی ئەوەیە داواکەی جێبەجێ بکرێ". یەکسەر فەرمان بە بەربوونی تاوانبارەکە ئەدات.

## ٤٨- رووپەڕەیەکی سپی لە مێژووی لەشکری عوسمانیدا

لە ساڵی (١٩١٦)دا فیرقەیەکی عەسکەری عوسمانی هاتە شاری سلێمانی، وە لە قشڵەدا جێگایان نەبووەوەو بەناچاری قائیدەکەیان فەرمانیدا بە چۆڵکردنی مزگەوتەکان کە لەو کاتەدا (٣٥) مزگەوت لە سلێمانیدا بوو. لەم مزگەوتانە (٣٤)یان چۆڵکرا مزگەوتی ئیمە نەبێ کە پێیان ئەگوت مزگەوتی ( حاجی شێخ ئەمینی خاڵ). دوو سێ جار هاتنە سەرمان کە بۆچی ئەم مزگەوتە تا ئێستا چۆڵ نەکراوە، پێیان وتن: "ئیمامەکە دەرناچێ". رۆژێ قائیدەکە بەسواری هات بۆ مزگەوت وە دوو عەسکەری لەگەڵدا بوو، لەبەر قاپی دابەزیو خۆی هاتە ژوورەوەو پرسی: ئیمامە ئەفەندی لەکوێ دائەنیشێ؟ وتیان: "لەو باڵەخانەیە"، قائید سەرکەوتو چووە ژوورەوەو سەلامی کرد، باپیرم لەو کاتەدا دەوری دەلائلی ئەکردەوە، وە زۆر لە باپیرم وردبووەوە، وە پیاوێکی خوا پەرستو بەرێزی هاتە پێش چاو، رووی کردە باپیرم لێی پرسی: "تورکی ئەزانیت"؟ فەرمووی: "نەخێر"، وتی: "تەرجومانێك پەیدا بکە". باپیرم منی نارد بەدوای (حسێن ئاغای کوڕی حاجی حەمە صاڵح)دا، کە حسێن ئاغا هات قائید لێی پرسی: "ئەم شێخە کێیە"؟ وتی: "ئەوە حاجی شێخ ئەمینی خاڵە شێخی تەریقەتی نەقشبەندییە، وە زانایەکی زۆر گەورەیە، وە بەشی زۆری ئەم شارە موریدی ئەمن"، وتی: "لێی بپرسە بۆچی مزگەوتەکەی تا ئێستا بەجێنەهێشتووە"؟ باپیرم فەرمووی: "دوو کوڕی گەورەو عالمم بوو (عەلیو عەبدوڵلا) لەماوەی ئەم سێ ساڵەدا کۆچی دواییان کرد، کوڕی گەورەم ژنێكو پێنج کوڕی منداڵی لەپاش بەجێماوە، وە بە پەنجە ئاماژەی بۆ من کردو فەرمووی: ئەمە کوڕە گەورەکەیەتی کە لەو کاتەدا تەمەنی (١٢) ساڵ بووە، وە من ماڵەکەم بۆ بەجێهێشتووە، وە خۆم هاتوومەتە ئەم هۆدەیە، وە جێگایەك شك نابەم کە بمانەوێ ، لەبەر ئەوە ماومەتەوە"، قائیدەکە وتی: "با لەجێی خۆی بمێنێتەوە، وە هەر زابتێکی تر هاتو وتی برۆن بڵێ قائید خۆی هاتە ئێرە، وە فەرمانی داوە بە مانەوەی". لەپاشا قائید پرسی لە حسێن ئاغا "ئەم شێخە خەتمی نەقشبەندی ئەکات"؟

ئەویش وتی: "هەموو شەوی سێ شەممەو جومعەیەك لە بەینی مەغریبو عیشادا خەتم ئەکات"، ئیتر دوای ئەوە هەموو ئێوارەیەکی سێ شەممەو جومعە ئەو قائیدە بە سواری ئەهات بۆ مزگەوتو دوو عەسکەری لەگەڵدا بوو، وە

قائیدەکە ئەچووە ژووری مزگەوت و جەماعەتی مەغریبی ئەکرد، لەپاشا دائەنیشت لە خەتمدا تا بانگی عیشا ئەدرا ئینجا جەماعەتی عشای ئەکردو دوای ئەوە ئەگەڕایەوە، بەم رەنگە تا ئەو قائیدە لە سلێمانی بوو ئەمە ئیشی بوو.

هەر لە کۆتایی (١٩١٦)دا پارێزگارێکی تورك لە ئەستەمبوڵەوە نێردرا بۆ سلێمانی. دوای مانگێك ئەم پارێزگارە هاتە لای باپیرمو زۆر بەرێزەوە پێی وت: "من مانگێکە خۆم بەتەنها هاتووم بۆ سلێمانی، نازانم ماڵو منداڵەکانم بێرم بۆ ئێرە یان نا"؟ باپیرم کەمێك ماتبوو لەپاشان فەرمووی: "ئەوەندەی هاتووی ئەوەندەی تریش چاوەڕوان بکە". مانگی تەواونەکرد ئێوارەیەکی تر پارێزگار هاتەوە خزمەت باپیرم بۆ سوپاسکردنی کە لەسەر قسەی ئەو ماڵو منداڵی نەهێناوە، ئێستا فەرمانی نقلی دەرچووە بۆ ئەستەمبوڵ.

## ٤٩- زوهدی حاجی شێخ ئەمینی خاڵ

فائیق بەگی تاپۆ بەڕەحمەت بێ[1]، کە بوو بە سەرۆکی مەحکەمە لە کەرکوك، هەموو مانگێك جارێ یان دوو جار ئەهات بۆ سلێمانی بۆ سەرۆکایەتی ئەو لیژنەیەی کە پێك ئەهات لە سێ حاکم بۆ محاکەمەی کوبرا، کە من ئەوکاتە قازی سلێمانی بووم، هەموو جارێك ئەهات بۆلام یەکەمجار کە هاتە لام باسی باپیرمی بۆ کردم، وە وتی: "لە ساڵی (١٩١٨)دا (مێجەر نۆئیل) حاکمی ئینگلیز بوو لە سلێمانی، وە منیش وەك سکرتێری وابووم، رۆژێك پێی وتم بچۆ بۆ لای حاجی شێخ ئەمینی خاڵو پێی بڵێ لە رۆژێکەوە کە هاتووینەتە ئێرە مانگی (٢٠٠) روپیەمان بۆ بریوەتەوە، وە جوابمان بۆ ناردووە کە هەموو مانگێك یەکێك بنێرێ مانگانەکەی وەربگرێ، تا ئێستا نەیناردووە بۆی، ئەمە (٧٥٠) روپیە کە مانگانەی سێ مانگ و نیویەتی بۆی بەرە، وە پێی بڵێ کە لەمەولا مانگ مانگ بۆی بنێرێ.

وە منیش رووم نەهات بچمە خزمەتی چووم بۆلای حاجی تۆفیق ئەفەندی تازە دەوڵەمەند، کە موریدی حاجی شێخ ئەمینی خاڵ بوو بۆ ئەوەی بێ لەگەڵما (کەچووین پارەکەم لەبەردەمیا دانا و قسەکەی مێجەر نۆئیلم پێ وت، ئەویش پارەکەی فرێدایەوە بەردەممو وتی: "من لە خەلافەتی سوڵتان عەبدولحەمیددا مانگانەم وەرنەگرتووە ئێستا لە ئینگلیز مانگانە وەرئەگرم"؟!

بە تەئریخی (٨)جماد الاولی (١٣٣٧)ی کۆچی حوکمداری کوردستان شێخ مەحمود (٥٠) روپیە مانگانەی بۆ باپیرم بڕییەوە بە فەرمانێکی ئیمزاکراوی ..، کە ئەو فەرمانەم لایە، بەڵام ئەویشی وەرنەگرت.

## ٥٠- یادی باخەکۆن

* ئەمڕۆ ئێرە دیوەخانە، سبەینێ هێلانەی مشکانە.

* ئەمڕۆ دنیایە، سبەی زوڕنایە.

ئەم دوو قسە نەستەقە ئەوە ئەگەیەنێ کە هەموو شوێنێك لە سەرەتاوە ماوەیەك ئاوەدان و رێکوپێکە، دوای ئەوە بەماوەیەك بەرەبەرە چۆڵ ئەبێ و بێکەس ئەکەوێ، مەگەر زوڕنای تیا لێبدرێ، ئەمە دەستوورێکی ناچارییە لە هەموو جیهانا، هەروا بووەو هەروا ئەبێ هەتا دنیا دنیابێ.

سێبەری ئەم خێوەتە شینەی کە بەژوور سەرمانەوەیە، کە جێی ئاسایش و خۆشی بووە، کێ لەژێریا ماوەتەوەو حەساوەتەوە؟! گەردشی رۆژگار هەزاران هەزار خانەدانی تێکداو وێرانیکرد.. چاو هەڵبڕەو تەماشای تاقی کیسرا بکە، کە ساڵەهای ساڵ جێی شاهانی ساسانی بووە، ئێستا جاڵجاڵۆکە پەردەگێڕو کوندەپەپوو گۆرانی بێژیەتی. سەرێك لە

[1] فائق بەگی سەرۆکی مەحکەمە لە کەرکوك لە ناوەڕاستی چلەکانەوە تا سەرەتای پەنجاکان بە حوکمی وەزیفە سەردانی سلێمانیی ئەکرد بۆ بەشداربوون لە مەحکەمەی کوبرادا، وە لە کۆتایی ساڵی (١٩٥٠)دا خانەنشینکرا.

کۆشکەکەی سوڵتان عەبدولحەمید بدە کە ئیمپراتۆری هەموو عالەمی ئیسلامی بووە، ئێستا مشك تەراتێنی تیا ئەکاتو پەپوو تێیدا ئەخوێنێ.

ئەوە لەم تەنیشتەوە (باخەکۆن)[1] کە چەند ساڵێك لەمەوپێش شێخی حوسام ئەلدین تیا دائەنیشت، کە کوڕی شێخ بەهائەلدینو نەوەی شێخی سیراج ئەلدین شێخ عوسمانی تەوێڵە بووە، پیرێکی تەریقەی نەقشبەندی بوو، شەوو رۆژ خەڵك ئەچوون بۆ زیارەتی لە هەموو کوردستانی عێراقو ئێرانو تورکیاو، شەوو رۆژ چەندین کەس لە خانەقاکانیانا نانی ئەخوارد، وە چاو تێر نەئەبوو لە تەماشاکردنی باخو باخاتو تەلارو حەوزی ئاوو باڵەخانەو کۆشکی نهۆم لەسەر نهۆمی..

ئێستاش چۆڵو هۆڵ، بەردی بەسەر بەردییەوە نەماوەو دارو درەختێکی سەوزی بەپێوە نییە، وە ئەو فوارەیە بە عالەمی ئاشکرا ئەگریو ئەبارێنێ بەسەر ئەو خانەقاو جێگاو رێگایەدا، وە بە فرمێسکی چاو ئاوڕشێنی ئەو دەورو بەرە ئەکاتو لەگەڵ هەموو قولپێکا کە هەڵی ئەدا ئەڵێ:

روخاندی گەردشی گەردوون، لە هەرجێ ئاستانێ بوو

سووتاندی ئاسمان... لە هەرکوێ ئاشییانێ بوو

وەکو (طي سجل للكتب) پێچایەوە گەردوون

لە هەر مهمان سەرا، ئاثاری سفرەوە نانو خوانێ بوو

ئەم چەند شیعرە بەسەر ئەو حەوزو ئاوەو فوارەی باخەکۆنا وتراوە، کە ئەڵێ:

رأيت فوارة في منزل خرب

تبكي عليه بكاء العاشق الثمل

تذري الرياح أذا هبت مدامعاها

عليه حتى تروي الأرض بالبلل

هبها بكته أسي، لكن مقلتها

لولا الهوي لم ترق دمعاً على طلل

ئەم دەستوورە پایەدارو بەردەوامە تا ئەم جیهانە بمێنێ:

ئەیوانی جەم کە هەم دەمی کەیوان بوو مدتێ

ئەمڕۆ بە پەستی خانە خرابە لە چاڵ ئەچێ

هەر ناڵە وا لە بورجی جەلالا وەکو هلال

هەر ماهەوا لە کونجی مەلالا لە ناڵ ئەچێ

بەڕاستی مانو پایەداری هەر بۆ خوایە، هەموو شتێك ئەچێتەوە پەردەی نەبوونی تەنیا ئەو نەبێ (كل شيْ هالك إلا وجهه* له الحكم وإليه تُرجعون)، (كل من عليها فان* ويبقى وجه ربك ذو الجلال والإكرام).

ئەو باخەکۆنەی کە جاران بەهەشتی سەرزەوی بوو، دڵی تیا ئەکرایەوەو چاوی تیا ئەگەشایەوەو گیانی تیا پەروازی ئەکرد بۆ (اعلى عليين)، ئێستا هەموو بەیانیانێكو ئێوارانێك پەپوویەك سەری تیا دەرئەهێنێ و ئەڵێ:

(لمن الملك اليوم؟ لله الواحد القهّار).

### ٥١- رووپەڕەیەکی نەنووسراو لە مێژوودا

لە ئابی (١٩١٦)دا بەبۆنەی هێرشی رووسەوە بۆ سەر کوردستانی ئێران، ساداتی زەمبیل کە پێنج برا بوون (سەید عەبدولحەکیمو حاجی بابە شێخو سەید سەلامو سەید حسێنو سەید حەمە ئەمین) بەخۆیانو ماڵو منداڵو دەستو پێوەندیانەوە هاتن بۆ سلێمانیو پیاوێکیان نارد لەپێش خۆیاندا بۆلای باپیرم (حاجی شێخ ئەمینی خاڵ)، کە ئێوارێ

[1] باغەکۆن دێیەکە ئەکەوێتە نێوان (گوڵپ)و (گەچێنە) لە ناوچەی هەورامان، مەرقەدی شێخ حسامەدینو شێخ موحەممەدی کوڕی لێیە.

دوای رۆژئاوا ئەگەنە پێشەوەو، میوانی ئێوە ئەبن.. باپیرم جوابی نارد بۆ ماڵەوە کە نان دروستبکەن، دوای رۆژئاوا بە نیو سەعات گەیشتنە پێشەوە، پیاوان هەموو هاتنە مزگەوتو ژنانیش چوونە ماڵەوەو، چەند شەوێك مانەوە.. دوای سێ رۆژ سەید عەبدولحەکیم کوڕە گەورەی سەید عەبدولکەریم زەمبیل بوو، نامەیەکی نووسی بۆ شێخ مەحمودی نەمر، کە لە دێی (داری کەلی) خانووەکەی خۆی بداتێ تا ئەگەڕێتەوە، شێخ مەحمودیش خانووبەرەکەی (داری کەلی) دانێ، سەید عەبدولحەکیم بە خۆیو ماڵو منداڵیەوە چوونە ئەوێ دانیشتن. لەپاش ئەوە هەموو دە پانزە رۆژێك سەید عەبدولحەکیم خۆی ئەهات بۆ خزمەت باپیرمو یەك دوو رۆژ ئەمایەوە لای، لەپاشان ئەگەڕایەوە بۆ (داری کەلی).. براکانی هەریەکە ماڵێکی بەکرێ گرت، لە گەڕەکی گۆیژەو تیا دانیشتن. لە کۆتایی پایزدا کە رووس گەڕانەوە، ئەوانیش گەڕانەوە بۆ زەمبیل.

## ٥٢ – لە بیرەوەرییەکانی منداڵیم

لە گەرمەی رشانەوەکەی ساڵی (١٩٠٣) دا منی سەرسەخت لە سکی دایکما بووم، بەخوێنی ترسو بیمی رشانەوەو خەمو خەفەتی مردنی خزمانو خوێشان پەروەردەکراوم، وە لە ئاخرو ئۆخری رشانەوەکە لە ساڵی ١٩٠٤ دا هاتوومەتە جیهانێکی پڕ لە خەمو خەفەتو دەردی سەرییەوە، کە هەرچی خەندە بێ بەسەر روخسارو، بزەبێ بەسەر دەمو لێوەوە نەبووە. لۆرەمان (لاحول ولا قوت إلا بالله) وە گۆرانیمان (إنا لله وإنا اليه راجعون) بووە.

لە ئاخرو ئۆخری ساڵی (١٩٠٧) دا باپیرم حاجی شێخ ئەمینی خاڵ لە سەفەری حاج هاتەوە، دوای دوو ساڵ کە لە مەککەو مەدینە مایەوەو، منیان برد بە پیریەوە لە (تووی قۆجە) منیان دایە دەستی، گرتمی بە سنگیەوەو ماچی کردم، وە سەرو دەمو چاوم لە ناو ریشی سپییا (کە وەك ئاوریشمی خاو وابوو) نقووم بوو، وە ئەوکاتەم (سا لەبەر هەر شتێك بێ) لەبیر نەچۆتەوە.. ئەو چەند رۆژە قەرەباڵغییم ئەدی، وە پێکەنینم بەرگوێ ئەکەوت.

لە ساڵی (١٩٠٩) بەفرە گەورەکە باری، کە هەرچی خانووی شاری سلێمانی بوو وەك لە چلوورەو شووشە سەهۆڵ گیرابێ وابوو، چونکە هەرچی گوێسەوانە هەبوو لە بنمیچەوە تا ئەرز شووشە سەهۆڵ بوو، وە چلوورە بە چواردەوری خانوودا وەك یاساوڵ دەوری دابوو، وە لووتی گەیشتبووە سەر زەوی. (حاجی کەریمی شمقار) شێرە بەفرینەیەکی زۆر گەورەی دروستکردبوو لەسەر شارێی سابوونکەران لە پشت ماڵی رەشیدی مەمەدەوە، کە ئەو شێرە بەفرینەیە تا بەهارێکی درەنگ مایەوە.

لە ساڵی (١٩١٠) شێخ عەبدوڵڵای مامم خوێندنی تەواوکرد لە خزمەتی خوالێخۆشبوو (شێخ نەجیبی قەرەداخی)دا، وە ئیجازەی عیلمی وەرگرتوو گەڕایەوە بۆ سلێمانی. فەقێی (مستعد) لە زۆر لە مزگەوتەکانەوە ئەهاتن بۆ خزمەتی بۆ دەرسخوێندن، وە رۆژی هەشت نۆ دەرسی لە کتێبە بەرزەکان ئەوتەوە، وەك (تهذيب)و (جمع الجوامع)و (گلنبوی برهان)و (تحفەی ابن حجر).

دوای بەفرەکە بە مانگو نیوێك تەرزەیەك باری لە سلێمانی، لافاوی ئەو تەرزەیە چەند ماڵێکی لە ژوور ماڵی ئێمەوە برد، وە دارو حەماڵو چڵو چێوی ئەو خانووانەی هێنا لە بەینی ماڵی ئێمەو مزگەوتا توندیکرد.. ئەو لافاوە پەنگی خواردەوە تا لە نیوە شەودا ماڵی ئێمە پڕبوو لە ئاو.

**٥٣ – بیرەوەری**

خانووەکەی (تۆفیق قەزاز)ی ئێستا کە لەگەڵ حەمامی گازیّو دیوەخانو رەزەکەی ماڵی (حەمەی ئەورەحمان ئاغا) لەگەڵ خانووەکەی (میرزا فەرەجی حاجی شەریف)، کە ئێستا بەدەست منداڵەکانی (تۆفیق ئەفەندی ئاغا فەتحوڵڵا)وەیە، واتە ئەم (٢٠–٣٠) هەزار مەترە چوارگۆشەیە، خانووی (عەبدوڵڵا بەگی ئیسماعیل بەگی خالید بەگی موحەممەد پاشای خانە زێڕینەی بابان) بووە.

والی موصڵ بە خۆیو کۆمەڵێکی گەورەوە دیّ بۆ تەفتیشی لیوای سلێمانی، لە ماڵی (عەبدوڵڵا بەگی کوڕی ئیسماعیل بەگ) دائەبەزیّ، چەند رۆژێك ئەمێنێتەوەو زۆر خزمەت ئەکریّ لەلایەن عەبدوڵڵا بەگەوە. تەنانەت لە باپیرم بیستووە کە ئەویش لە باوکی بیستووە، لەو شەوانەدا کە والی میوانی ماڵی عەبدوڵڵا بەگ بووە، کوڕانی گەڕەکی گۆیژە شەو بەسەر جادەدا دێن، ئەگەنە بەر ماڵی عەبدوڵڵا بەگ، ئەبینن ئەو ماڵە گەورەیە هەمووی چراخانە، وە قەڵەباڵغییەکی یەکجار زۆری تیایە، کوڕەکان کە ئەچنە ژوورەوە حەوشەیەکی گەورەو چیمەنێکی پانو پۆڕ ئەبینن، کە ئەچنە ناو چیمەنەکەوە یەکێکیان ئەڵیّ: "کوڕینە با بڕۆین چیمەنەکە ئاوی کراوەتە سەر". تومەز نانی ئێواریّ خوراوەو پڵاوو شلەیەکی ئێجگار زۆر ماوەتەوە. پڵاوەکە لە گۆشەیەکی چیمەنەکەوە رۆکراوە، شلەکەش لەولاترەوە رۆکراوە. رۆنو چەورایی ئەو چێشتانە چۆتە ناو چیمەنەکەوە، کە کوڕەکان بە ئاویان زانیووە، گوایا ئاو کراوەتە سەر چیمەنەکە!!

والی پاش چەند رۆژێك عەبدوڵڵا بەگ لەگەڵ خۆیا ئەبا بۆ رانیە، وە ئەیکا بە قائیمقامی ئەویّ. لەپاشا لە رانیەوە نەقڵ ئەبیّ بۆ کۆیەو لەوێشەوە بۆ کفری. لە کفری کۆچی دوایی ئەکا، وە هەر لەویّ نێژراوە.

ئەم خانووانە کە (٢٠–٣٠) هەزار مەترە چوارگۆشەیە ئێستا چۆڵو هۆڵە، پەپوو تیا ئەخوێنیّ، بە زمانی حاڵ ئەڵێن (لِمَنِ المُلكُ اليَوم) واتە ئەم خانە دانانە هی کێنو لەکوێن؟! هەر خۆی بەزمانی حاڵ وەڵام ئەداتەوە، ئەڵیّ: (لله الواحد القهّار) واتە بۆ خوای تاكو تەنیای زاڵی دەست رۆیووە.

**٥٤ – کتێبی بێتوشی**

لە ساڵی (١٣٤٢)ی کۆچیدا (کفاية)ی مەلا عەبدوڵڵای بێتوشیم ئەخوێند لەلای شێخ جەلالی قەرەداخی (بەڕەحمەت بیّ) زۆر بە شیعرەکانی بێتوشی ئەگەشامەوەو، زۆرم پیّ جوان بوون لە مەبەستو داڕشتندا، نەخوازەڵا ئەم دوو شیعرەی کە لە تەعریفی منظومەی کفایەدا ئەڵیّ:

أغربت في أنشاءها أغرابا

فهي تجل عربا أترابا

يحدي بها في الدوي للأيانق

وتمتري دموع كل وامق

منیش ئەگەڕام بەشوێن شیعرەکانیا، نوسخەیەکی حفایەم لەلابوو لە شەرحی کفایەدا، هەموویم دەورکردەوە(٣٠–٤٠) شیعرێکی خۆی تیابوو وەرمگرتو دەستمکرد بە نامەنووسین بۆ (أحساوو بحرینو قطيف)و چەند شارێکی تر داوامکرد ئەگەر شیعری بێتوشییان لەلا هەیە بۆم بنێرن، چەند غەزەلو قەصیدەیەکم بۆ هات. خۆلاسە لە ساڵی (١٩٥٧) دا کتێبی بێتوشیم تەئلیفکردو لەچاپمدا، لەدوای چاپکردنی شەوێکیان لەخەوما چوومە مزگەوتی خۆمان، یەکیّ پێی وتم موحافیزەکانی عێراق هەموو لە ژوورەکەی باپیرتن، منیش لێکمدایەوە چوار موحافیزیان ئاشنام بوون، یەکێکیشیان خزمە. بەوبۆنەیەوە چوومە ژوورەکەی باپیرم تەماشام کرد(١٤)مێزەر بەسەری لیّ دانیشتوون، کەچوومە ژوورەوە بینیم دانیشتوون بەدەوری ژوورەکەداو جێی سیّ چوار کەس بەتاڵ بوو. منیش سەلامم لێکردن. وەڵامی سەلامەکەیان نەدامەوە، لەدڵا دڵگیر بووم. یەکێکیان لەسەرەوە دانیشتبوو عەبایەکی سووری بەشانەوە بووو مێزەرێکی کوردانەی بەستبوو، ریشی چەناگەی سپی بووبوو، کە هەر چەناگەی ریشی پێوەبوو، وە لە سەرۆکیان ئەچوو، منیش دانیشتم لەپاش چەند

دەقیقەیەك یەکێکیان روویکردە سەرۆکەکەو پێی وت: "قوربان فلان کەس ناتناسێ، بۆیە قسەت لەگەڵ ناکات"، ئینجا ئەو رووی کردە منو وتی: "فلان کەس من زۆر موخلیصی تۆم کە ماوەیەکی زۆرە بەشوێن شیعری بێتوشیدا ئەگەڕێیت، قاموسەکەی (نصیری هۆرێنی) پەیدابکە شیعری بێتوشی ئێجگار زۆر لەلای راستو چەپی قاموسەکە نووسراوەتەوە، ئیتر خەبەرم بووەوە، مانای خەوەکەم نەزانی، بەڵام تێگەیشتم ئەو سەرۆکەی قسەی لەگەڵ کردم بێتوشی بوو.

دوای ئەم خەوە بە دوو سێ ساڵ عەللامە (مەلا موحەممەدی قزڵجی) (بەرەحمەت بێ) لە بەغداوە هات بۆ سلێمانیو میوانی من بوو، لەپاش چەند رۆژێ خەوەکەم بۆ مەلا موحەممەد گێڕایەوە، مەلا موحەممەد وەزعێکی بەسەراهات، زۆر گەشایەوە بە خەوەکەمو وتی: "واللە واللە ئەم خەوەی تۆ راستە، چونکە نصری هۆرێنی حاشییەیەکی بەسەر قاموسەوە نووسیوە ئەوەی تۆ ئەتەوێ لەوێدا هەیە!!

**لە بڵاوکراوەکانی پرۆژەی (تیشك)**

| زنجیرە | ناوی کتێب | نووسەر |
|---|---|---|
| ١ | بەئیسلامکردنی کورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە؟ | ن: فازل قەرەداغی |
| ٢ | نەزانیی و بێشەرمیی، بەشێك لە چەواشەکارییەکانی مەریوان هەڵەبجەیی لە کتێبی (سێکس و شەرع و ژن)دا | ن: عومەر کەمال دەروێش |
| ٣ | ئاشتینامە، وەڵامێك بۆ (خوێننامە)ی زەردەشتی | ن: ئامینە صدیق |
| ٤ | فەتواکەی مەلای خەتێ،<br>ئەفسانەی مێژوونووسێك | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٥ | صەلاحەددینی ئەییوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن | ئامادەکردنی:<br>ئارام عەلی سەعید |
| ٦ | بەرەو بەختیاری ئافرەت<br>"بەرگی یەکەم" | جەمال حەبیبوڵلا "بێدار" |
| ٧ | ئازادیی رادەربڕین لە رۆژئاوا، لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی | ن: د. شەریف عەبدولعەزیم<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٨ | بەجیهانیکردن، دیدێکی ئیسلامیی | ن: د. موحسین عەبدولحەمید<br>و: حەمەکەریم عەبدوڵلا |
| ٩ | کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ١٠ | بەرەو بەختیاری ئافرەت<br>"بەرگی دووەم" | ن: جەمال حەبیبوڵلا "بێدار" |
| ١١ | مێژووی دێرینی کوردستان<br>"بەرگی دووەم" | ن: فازل قەرەداغی |
| ١٢ | سەدەیەك تەمەنی نوورین، مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە | ئا: عەبدولدائیم مەعروف هەورامانی |
| ١٣ | دەوڵەتی خیلافەت، بوژاندنەوەی کۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانییەت | ن: ئیکرام کەریم |
| ١٤ | لە سەرگوزشتەکانی ژیان، ئەدەبی گاڵتەوگەپ، روداوی مێژوویی، بیرەوەریی | ن: شێخ موحەممەد خاڵ |